# حەسەنی بەصری

سەحەرێک

بۆ تاریکستانی **دڵەکان**

نووسینی : بدریە عەزیز

١٤٢٩ک - ٢٠٠٨ز

# ✍پێشکەشە بە ..

❀ دایك و باوکم کە پەروەردەیانکردم...

❀ بۆ هەموو ئەوانەی لەپێناو بەدەستهێنانی ڕەزامەندی خوادا خزمەت بە مرۆڤایەتی دەگەیەنن...



## ✍ زۆر سوپاس بۆ بەڕێزان...

❀ مامۆستا کاکەڕەش سەیدمینە

❀ مامۆستا ئەحمەد سەید محمود

❀ مامۆستا نەوزاد فەقێ ئیبراهیم

کە بەهۆی سەرنج و پێشنیارەکانیان و پەیداکردنی سەرچاوەو زانیاری لەسەر بابەتەکە هاوکارییانکردم.. خوای گەورە بە بەهەشتی بەرین پاداشتیان بداتەوەو نمونەیان زیادبکات.. آمین

بسم الله الرحمن الرحیم

"الحمد لله حمداً یوافي نعمه، ویکافيء مزیده. الحمد لله علی نعمائه، والصلاة والسلام علي رسول الله محمد المبعوث رحمة للعالمین، وعلی آله وصحابته، ومن تبعهم بإحسان إلی یوم الدین"

بەڕاستی لەبەخشندەیی و میهرەبانی خوایە بەسەر نەتەوەی ئیسلامەوە، کە پەیمانیداوە بەپاراستنی (قورئان و ئاینی ئیسلام)،خوایپەروەردگار دەفەرمویٚت:﴿ إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ﴾[1]

ئیسلام ئاینێکی زیندوو نەمرە، خاوەنی سەروەت و سامانێکی گرنگ و گەورەیە لەو هەموو زانستە فراوانە، بیروباوەڕێکی پارێزراوو ئیمانێکی بەهێزە، سوننەتێکی پاك و پوختەیە، خاوەنی ڕەوشتێکی ڕاست و ڕێکە، سامانێکی تەواوی بەرنامەبۆدارێژراو و کۆکراوەیە، ئەدەبیکی ئیسلامی جوانە بۆ هەرکەسێك پەیڕەوی لیٚبکات وەکو ئەو بەرنامەیە کە خەلیفەکانی(ڕەزای خوایان لیٚبیٚت) ڕاشیدین پەیڕەویان دەکرد، جەنگینە لەگەڵ نەفامیەتی ماددی،و گەڕانەوە یە بۆلای خواو بۆ خانەی ئاشتی.

نهێنی ئەم ئاینە ئەوەیە کە ناگەشیٚتەوەو ناژی و چالاك نابیٚتەوەو ناگەڕیٚتەوە سەردەمی لاویی لەدوای لاوازی و کزبوونی، وە لەگەڵ کۆمەڵگەی سەردەمدا ناگونجیٚت و لەگەڵ گیانی سەردەم لەبارنابیٚت و ڕێك ناکەویٚت...

---

[1] - الحجر: ٩ /واتە: بەڕاستی هەرئێمە قورئانمان دابەزاندووەو بیٚگومان هەر ئێمەش پارێزگاری دەکەین و(نایەڵین دەستی خیانەتکار هیچ جۆرە دەستێکی تێ بخات و هەموو جۆرە هەوڵێك بۆدەستکاری کردنی تەزۆکە).

لەڕێگەی ئەو پیاوە بلیمەت و هەڵکەوتوانە وە کە سەدە لەدوای سەدەوەو سەردەم لەدوای سەردەم دەردەکەون.

پێغەمبەر -ﷺ- دەفەرموێت:

"إن الله يبعث لهذه الأمة على رأس كل مئة سنة من يجدِد لها دينها"[1].

بەڵێ، لەهەر سەردەمێك لەسەردەمەكاندا خوای گەورە كەسانێك ئامادە دەكات كەنەفسی خۆیان بەند ئەكەن، شەوەكان زیندوو دەكەنەوە، لە ڕۆژەكانیشدا زەحمەت و ماندوویتی دەچێژن و، توانای خۆیان دەخەنەكار بۆ توێژینەوەو فێربون و لێكۆڵینەوەی ئەم ئاینە،بۆڕووبەڕووبونەوەی دوژمنان و، دەرخستنی گومان و دوودڵی، بەگومان و دوودڵەكان، هەڵبەتە ئەم فەرمودەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) هەموو تاكو كۆمەڵێك دەگرێتەخۆ، هەروەكو بۆهەموو كات و شوێنێكیشە. بەدڵنیاییەوە باس و گێڕانەوەی بەسەرهات وژیانی ئەو ناودارانە بۆدەرخستنی لایەنە مێژووی یە یەكەیەنەبووە لەپەڕاوەكاندا، بەڵكو هەروەكو لەپەڕاوەكاندا نوسراوە بۆ خستنەڕووی لایەنی پێشەنگیەتی باشی ئەوانە، بۆ سیفاتی بانگخوازییان، ئەمەیش دەریدەخات كەخوای گەورە بەگوێرەی پەیمانەكەی ئەم ئایینە دەپارێزێت.

لێرەوە كەئەو زانایانە خەڵك بانگهێشت دەكەن بۆلای خوای بەرزو باڵا ئەوانە میراتگری پێغەمبەرانن، وە پوختەی بەندە چاكەكانن، بەڕاستی تەقواو لەخواترسان توێشووی گەڕانەوەیە بۆلای خوا.

[1]- ئەبو داود گێڕاویەتییەوە (٤٢٩١)، واتە: "خوای گەورە لەهەر سەد ساڵێكدا جارێك بۆ تازەكردنەوەی ئەم ئاینە كەسێك ئەنێرێت"

*"وتزودوا فإن خيرالزاد التقوى"[1] .*" ... إن أكرمكم عندالله أتقاكم"[2] .
*"إتق الله حيث ماكنت"[3]

ئەوەتا خۆشەویستمان محمد(ﷺ) دەفەرموێت: (باوەڕ وەکو کاڵا وایە لەدڵتاندا کۆن دەبێت وەکو چۆن بەرگێك کۆن دەبێت و خەریکە بدڕێت، داوا لەپەروەردگار بکەن ئیمان لەدڵتاندا نوێ بکاتەوە)[4].

هەروەها دەفەرموێت: (هیچ دڵێك نییە جاروبارێك هەور نەیگرێت، هەروەکو چۆن هەور بەری مانگ دەگرێت و تاریك دەبێت، کە هەورەکە ڕەویەوە ئیتر شەوقی مانگ دەردەکەوێتەوە)[5].

بەڵێ، دەروونی ئادەمیزاد وەڕس و بێتاقەت دەبێت و لەکار ماندوو دەبێت و، لە پەرستشدا خاوو تەمبەڵ دەبێت، بەڵام کاتێك بڕبەندێ تیژی دەکاتەوەو تێکۆشەرێك سەرپەرشتی دەکات، یا بیرخەرەوەیەك ئامۆژگاری دەکات، ئەو فێڵ و خاوی وکولی وسستییە دەڕوات و،بەهەواڵ و سەربوردەو ژیانی لە خواترس و پارێزکاران و پیاوچاکان و ملکەچی صۆفییەکان، چالاك دەبێتەوەو، سەرلەنوێ دەست دەداتەوە کرداری چاکەو ئەوکاتە هەست دەجولێت و خاوی و سستی دەبێتە پەرۆشی، هیلاکی و ماندوویی لەکاردا نامێنێت و، دڵسۆزانەو لەخۆبردوانە دێتەوە مەیدانی بەندایەتی و گوێڕایەڵی فەرمانی خوای گەورە.

---

[1] - البقرە ۱۹۷/واتە:" توێشوو بخەن، چاکترین توێشوو تەقواو لەخواترسانە"
[2] - الحجرات۱۳/واتە: "... چاکترینتان لای خوای گەورە بەتەقواترین و لەخواترسترینتانە".
[3] - پێغەمبەر(ﷺ)دەفەرموێت: "لە هەرکوێ بویت لەخوا بترسەو پارێزگاربە". ترمزی گێڕاویەتیەوە (ریاض الصالحين ٥/٦١ ص٤٧).
[4] - طبرانی لە(معجم)ەکەیدا ئەم فەرمودەیەی گێڕاوەتەوە.
[5] - رواه (النعيم) في (الطيه).

أبو حەنيفە (نعمان كوڕی ثابت) دەفەرموێت: " ژیان و سەرگوزشتەی پیاوچاكان لای ئێمە خۆشەویستترە لەزۆرێك لە زانستە شەرعییەكان، چونكە زانستی شەرعی ولێكۆڵینەوە لەزانست بەبێ زیكرو ئامۆژگارییەك كەدڵەكان نەرم بكات، و،بەبێ بیرخستنەوەیەك كە گوێی بۆشل بكرێت، دڵ وا لێدەكات تەنها داوای زانست بكات نەك كردەوە، ئەو كاتە كردەوەی نامێنێت و دڵ وەك بەرد ڕەق دەبێت یان ڕەقتریش".

لەبەرئەوە ئەی خوشك و برای باوەڕدارم:

زۆر پێویستمان بەئامۆژگاری پیاوچاكان و زانینی چۆنێتی ژیان و ڕەوشت و كرداریان هەیە، بۆ شوێنكەوتنی ڕەفتاریان، تا بیانكەینە ڕابەرو پێشەواو ڕێگەی ئەوان بگرین، ئەو هەموو پیاوچاكی ودڵنەرمیەی ئەوان ببێتە ڕێنمایی و ڕێپیشاندەرمان... شاعیرێك دەڵێت:

ژیانی چاكان بگێڕەوە
چەند بارەی كەوە چونكە باسیان
وەكو برِبەند دڵی ڕاوچی
ساف و لووس دەكات دەیدا لەهەسان

پیاوچاكێك زۆر جار بانگی هاوەڵ و دۆستانی دەكردو دەیفەرموو: "وەرن با ساتێك بچینە كۆڕو مەجلیسی هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) و شوێنكەوتوان و پیاوچاكان و گوێ بۆئامۆژگاری ورێنماییەكانیان بگرین، -مەبەستی خوێندنەوەی ژیان و بەسەرهاتی ئەوان بوو-".

بەڵێ، پیاوچاكان، چرای ڕووناككەرەوەی ڕێگای ئەموستە چاوی گومڕایی و نەشارەزایی ڕێی ئیمان و خواناسین، لابەرو ڕەوێنی خەم و پەژارەن، مایەی خۆشی و سوكنایی دڵ و دەروونن، بەردەوام پێشەواو ڕابەری خواناسان

و ماندوێتی نەناسان بوون، سەرقافڵەی كاروانی باوەڕداران بوون، بانگكەرو ڕێنیشاندەری گومڕایان و بێئاگایان بوون. بەڵێ، لە لوتكەی بڵندی و چڵەپۆپەی بەرزیدا پیاوانێك دەبینیت لە تاكەكانی چاكترینی سەردەم، ئینجا لەسەردەمی دوای سەردەمی هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ كە لەكانیاوو سەرچاوەی هەڵقوڵاوی درێژەپێدەری نورو ڕۆشنایی محمدی ﷺ پاراوبوون بۆ كردنەوەی ڕێبازو ڕێچكەی لافاوی نورانی، تا بۆ دوای خۆشیان یەك بەدوای یەكدا لێی بخۆنەوەو پاراوبن، ئینجا دوای ئەوانیش .... ئینجا دوای ئەوانیش ...

## موسڵمانانی بەڕێز:

لێرەدا ناودارێك لەچاكەكاران، پێشەوایەك لە پێشەواكان، پیاوێك لەپیاوە باشەكان. بەڵێ ئەو پیاوەی كاتێك ناوی دەبرێت زوهدو دنیانەویستیمان بیردەخاتەوە، كاتێكیش باسی زوهدو دنیانەویستی بكرێت، ناوی ئەومان بیردەكەوێتەوە، ئەو مانای زوهدەو زوهدیش مانای ئەو.

هەرچەندە ئەو پێغەمبەری ﷺ نەبینیبوو، بەڵام لەزرنگی و هوشیاری و پاكیدا، لەترسان لەخواو ژیری و وەرع ودنیانەویستی وپارێزكاری و تەقوادا هەر لەهاوەڵە بەڕێزەكان دەچوو، هاوشێوەی ئەوان بوو.

عەلی كوڕی زەید دەفەرموێت: "ئەگەر ئەو پیاوە لەسەردەمی هاوەڵاندا ژیابایەو هاوتەمەنی ئەوان بوایە ئەوا هاوەڵان دەیانكردە پێشەنگی خۆیان و هەرگیز پێشی نەدەكەوتن". ئەو گەورەو سەرداری شوێنكەوتوان[1] بووە،

[1]- شوێنكەوتوو یان (تابعی): بەو موسڵمانانە دەوترێت كەپێغەمبەریان ﷺ نەبینیوە، بەڵام هاوەڵانی پێغەمبەریان ﷺ بینیوەو زانیاریان لەدەمی ئەوانەوە وەرگرتوە، بڕواداربوون و لەسەر ئیسلام مردوون.

لەیەك كاتدا هونەری زانست و زوهدو وەرع و پەرستش و دنیا نەویستی و خواپەرستی تیادا كۆبوو بووەوە.

یەكێك بوە لەو كەسە دەگمەنانەی كەخوای گەورە حیكمەت و رەوانبێژی لەسەر زمانی ئەوان دەرخستووە.

بەڵێ، ئەو پێشەوایە گەورەی شوێنكەوتوانە، پێشەوای زاهیدو زانا سەر راستەكانە، هەڵگری ئاڵای زانستە بۆ لای خوای گەورە، چاكترینی كەس لەدوای هاوەڵە بەرێزەكان شێخی ئیسلام (ئەبو سەعید حەسەنی كوڕی ئەبی حەسەنی یەسارلای بەصریە)خوای لێ رازی بێت.

بەراستی ئەم باسەی لەم پەرتوكەدا نوسراوە تەنها دلۆپێكە لەژیانی پڕ خێرو بەرەكەتی ئەو زانا بەرزو پیرۆزە.

## بنەماڵەكەی:

ناوی حەسەنی كوڕی یەسارە، سەرچاوە مێژووییەكان دەڵێن: حەسەن كوڕی ئەبی حەسەنی یەسار، بەرەگەز عێراقییە، باوكی دانیشتووی (میسان)[2] بووە، پێش ئیسلام بە(فەیروز)ناوبراوە، دواتر بەندەیەك بوە لە بەندەكانی میسان، لای پیاوێك لەبەنی نەجار لە ئەنصار، واهاتوە كە ئەو پیاوە (جەمیلی كوڕی قوطبە)بووە، پاشان ئازادكراوە و چووەتە مەدینە، لەوێ بووەتە خزمەتگوزاری هاوەڵی بەرێز (زەیدی كوڕی ثابتی ئەنصاری)[3]، دایكیشی(خەیرە)خزمەتگوزاری دایكی ئیمانداران (ئومو سەلەمەی مەخزومی) بووە ،مێژوونووسان دەڵێن:

---

[2]- میسان هەرێمێك بووە كەوتۆتە نێوان هەردوو شاری (بەصرە و واسط).

[3]- زەیدی كوڕی ثابتی ئەنصاری: نوسەری وەحی پێغەمبەری خوا ﷺ بووە.

دایکیشی هەر لەبەندەکانی میسان بووە[٤]، (ذهبی) ڕوونی دەکاتەوە و لەو ڕوانگەوە دەڵێت: دوای ئازادبوونی خەیرەو نیشتەجێبوونی لەمەدینەدا لەسەردەمی خەلافەتی ئیمامی(عومەری کوڕی خطاب)دا خوای لێ ڕازی بێت، یەسار باوکی حەسەن (خەیرە)ی خواستووە، ئەوکاتە خەیرە لای ئومو سەلەمەی دایکی ئیمانداران بووەو کارو پێداویستیەکانی بۆ جێبەجێ کردووە.

لەشاری مەدینەداو لەماڵی دایکی ئیمانداران -ئوم سەلەمە- حەسەن لەدایك بوە، باوکی بە ئەبی حەسەنی یەسارو دایکیشی بە ئوم حەسەن ناسراون، حەسەن لەژینگەی عەرەبی ئیسلامیدا گەورە بووەو گەشەی کردووە، ژیانێکی دەشتەکیانەی زبری هەبووە، کە ئەمە کاریگەری لەسەر هەڵکەوتی جەستەی هەبووە.

(ذهبی) لەباسی کونیەی حەسەن و نازناویدا دەڵێت: بە ئەبو سەعیدو ئەبو عەبدوڵا ناسراوە، خاوەنی کچێکیشی و، نازناوی (شێخی ئیسلامی) لێنراوە، هەروەکو پێشی وتراوە پێشەوای ئەهلی بەصرە، هاوچەرخ و هاوتەمەنی(محمد إبن سيرين)بووە کە هەردوکیان لەبەناوبانگترینی ئەوانەن لەقوتابخانەی بەصرە دەرچوون لەسەردەمی ئەمەوییەکان.

(حەسەنی بەصری و محمد إبن سيرين)کوڕی کارگوزار بوون، کەهەردوکیان زانستیان لەسەردەستی گەورەکانیاندا وەرگرتووە.

باوکی حەسەنی بەصری خزمەتگوزاری (زەیدی کوڕی ثابت)بوو کەناودارترین هاوەڵ بووە لەناو هاوەڵاندا و، سیرینی باوکی محەمەد

---

٤ - مێژونوسان دەڵێن: ئەو پیاوە لەنصاریە ژنێکی لەبەنی سەلەمە خواست و ئەوانی لەمارەیی ئەودا دا، ئەویش ئازادی کردن، هەندێك ڕایان وایە، ئەو ژنەی کە ئازادی کردن پوری ئەنەسی کوڕی مالیك-ڕەبیع کچی نەضر-بووە.

خزمەتگوزاری (ئەنەسی کوڕی مالیك) بووەو لەو هاوەڵە بەڕێزە وە فێری فەرمووده بووە، (حەسەن و محمد) ڕەحمەتی خوایان لێبێت هەردووکیان کەسایەتییەکی دیاربوون لە بەصرەداو هاوڕێی یەکتربوون.

## لەدایك بوونی

چەند نایابە مرۆڤ لەماڵێکدا لەدایك ببێت چاکەخواز، لەویش نایابتر ئەوماڵە ماڵی زانست و ڕێنمایی بێت.

بەلاتەوە چۆنە خوێنەری بەڕێز:

ئەو ماڵە ماڵێکی قورئانی بێت؟

ئەی چۆنە ئەگەر ماڵی یەکێك لەدایکی ئیمانداران بێت؟ بەڵێ شوێنی لەدایك بوونی ماڵیخاوەنی ئەم بەسەرهاتە(ئوم سەلەمە)یە خوای لیّ ڕازی بێت، چونکە دایکی لای دایکی ئیمانداران ئیشی کردوە.

خوای گەورە ئەم تایبەتمەندییەی بەم لەدایك بووەدابوو، کەماڵی (ئوم سەلەمە) تەنها شوێنی لەدایك بوونی نەبوو، بەڵکو داپۆشەرو لانەی چاودێری ئەوبوو، و،سنگی ئەو جۆگەلەو ئاودێری ئەوبوو، بەڵێ شیرە خۆرەی شیرەکەی بوو..

**کات؛** سەردەمی خەلافەتی ئەمیری ئیمانداران، خەلیفەی دادپەروەرو هاوەڵی خۆشەویستی پێغەمبەری خوا ﷺ ، (عومەری کوڕی خطاب)ە خوا لێی ڕازی بێت، بەدوو ساڵ پێش کۆتایی خەلافەتی ئەو زاتە بەرزو پیرۆزە.

**شوێن؛** شاری مەدینەی پیرۆزە، ساڵی بیست و یەکی کۆچی . ...

مژدەیان دا بەدایکی ئیمانداران(ئوم سەلەمە)ی خێزانی پێغەمبەری خوا(دروودی خوای لەسەر بێت)کەخوای گەورە کوڕێکی بەخشیوە بە خزمەتگوزارەکەی کەناوی(خەیرە)بوو، بەڕاستی ئەم مژدەیە دڵی دایکی

ئیماندارانی پڕ كرد لەخۆشی و شادمانی، بەختەوەری دەم و چاوی پڕنوورو شكۆداری گەشاندەوە، بەپەلە ناردی دایك و منداڵەكە بهێنن بۆلای، تاماوەی زەیستانی لەماڵی ئەودا بمێنێتەوە.

(خەیرە)زۆر بەڕێزو شیرین بوو لەلای (ئوم سەلەمە)و بەدڵ خۆشی دەویست، زۆر بەپەرۆشەوە تامەزرۆی بینینی كوڕە ساواكەی بوو، دوای كەمێك(خەیرە)هات و منداڵەكەی بەدەستەوە بوو، كاتێك (ئوم سەلەمە)چاوی بەمنداڵەكە كەوت، دەروونی پێی ئاسوودەبوو، هۆگری بوو.

ئەو منداڵە ساوایە زۆر جوان و ڕووخۆش بوو، ڕوخساری ڕووناك و ڕزارە بوو، ڕواڵەتی دڵڕفێن بوو، چاوبەتێڕوانینی ڕوون دەبووەوە.

(ئوم سەلەمە) سەیرێكی منداڵكەی كردو وتی: لەكوڕەكەت ناو (خەیرە)؟گوتی: نا، دایە گیان، ئەوەم بۆتۆ داناوە تا ناوێكی بەدڵی خۆتی بۆ هەڵبژێریت.

(ئوم سەلەمە) فەرمووی: لەسەر بەرەكەتی خوا ناوی دەنێین (حەسەن)، دوای ئەوە هەردوو دەستی بەرزكردەوەو دوعای خێری بۆكرد.

ئەم شادومانییە تەنها بۆ ماڵی دایكی ئیمانداران(ئوم سەلەمە)نەبوو، بەڵكو ماڵێكی تریشی لەماڵەكانی مەدینە گرتەوە، ئەویش ماڵی هاوەڵی بەڕێز(زەیدی كوڕی ثابت)"خوای لێ ڕازی بێت"بوو، چونكە (یەسار) باوكی ئەو منداڵە خزمەتگوزاری ئەو هاوەڵە بەڕێزە بوو، (یەسار)یش خۆشەویسترین و بەڕێزترین كەس بوو لەلای (زەید) "خوای لێ ڕازی بێت".

## گەشەکردن و پێگەیشتنی

حەسەنی کوڕی یەسار، لەیەکێك لەماڵەکانی پێغەمبەردا ﷺ گەورەبوو و گەشەی کرد، پەروەردەبوو لەژووری یەکێك لە خێزانەکانی پێغەمبەردا ﷺ، کە ماڵی (هیندی کچی سوهەیل) ی‌ناسراو بە دایکی سەلەمە[1] بوو.

گەیشتنەوەی ئەو ساوا بەختەوەرە بەدایکی ئیمانداران (ئوم سەلەمە) تەنها بەوەندەوە نەوەستا، .. بەڵکو سەری کێشا بۆ لەوە زیاتر... زۆرجار (خەیرە)- دایکی حەسەن- لەماڵ دەچووە دەرەوە بۆ جێبەجێ کردنی هەندێك لە پێداویستیەکانی دایکی ئیمانداران، منداڵەکەی لای ئەو بەجێ دەما، جارێك ئەومنداڵە شیرەخۆرە لەبرسان دەگریا، زۆر بەتوندی دەگریا، (ئوم سەلەمە) هەڵیگرت و بردی بۆ ژوورەکەی خۆی، مەمکی خستە دەمی منداڵەکە بۆ ئەوەی ئارامی بکاتەوەو (بیخافڵێنێ) تادایکی دێتەوە، هەرچەندە (ئوم سەلەمە) تەمەنی زۆر بوو، منداڵی ساواشی نەبوو، بەڵام بەهۆی جولانی سۆزو خۆشەویستیەوە بۆی، بەفەرمانی خوا شیرێکی جوان زایە مەمکی و منداڵەکە خواردی و پێی ژیربووەوە[1]، ویستی خوابوو شیری لێبێت، شیرێکی پیرۆزبوو، بەهۆی ئەم ژەمە شیرەوە بەزوویی زمانی کرایەوە، کە قسەی دەکرد زۆربەتوانا

---

[1]- دایکی سەلەمە: یەکێك بووە لە تەواوترین و ئاقڵترینی ژنانی عەرەب، زۆرترین خاتری هەبوو، خۆراگرترینیان بوو، زۆر زیرەك و زانا بوو، زۆر ڕیوایەتی هەیە(٣٨٧) فەرموودەی پێغەمبەری (ﷺ)گێڕاوەتەوە، لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا یەکێك بووە لەو ژنە دەگمەنانەی لە سەردەمی جاهیلیەتدا نوسینی هەبووە.

[1]- أ-"(حافظ الذهبی)لە (محمد بن سلام)و(أبی عمروالشعاب)بە سەنەدێکەوە بۆمان دەگێڕێتەوە"

ب-وە لە(صورة من حیاة التابعین) لەنوسینی "الدکتور عبدالرحمن رأفت الباشا"دا هاتووە.

ج- لەهەموو ئەو پەرتوکانەدا هاتووە کە باس لەژیانی دەکەن.

بوو، بەڵگەی بەهێزو ڕۆشنکەرەوە بوو، لەبەر ئەوە هەمووکەس گوێی بۆ قسەکانی دەگرت، کەپرسیاری لێدەکرا زۆر لێهاتوانە وەڵامی دەدایەوە، کە ئامۆژگاری دەکرد دەنگی بەرز دەکردەوە، فرمێسکی دەهات و دڵسۆزانە دەستی پێ دەکرد، کاریگەری لەسەر خەڵکی بەجێدەهێشت، کرداری پێش گوفتاری دەکەوت، هەروەك چۆن ڕۆشنایی بەرەبەیان پێش هەڵهاتنی خۆر دەکەوێت.

بەم شێوەیە (ئوم سەلەمە)دایکی حەسەنە لە دووڕووەوە:

١) دایکی یەتی بەهۆی ئەوەی حەسەن یەکێکە لە ئیمانداران.

٢)دایکی یەتی بەهۆی شیر پێدانی.

* * * *

گونجان و لەیەك گەیشتن و خزمایەتی و لێك نزیکی یەکی زۆرهەبوو لەنێوان دایکانی ئیمانداران،لەبەختیاری حەسەندا بەهۆی نزیکی ماڵەکانیانەوە،ئەونزیکیە وای کردبوو کەئەو لەناو ئەوماڵانەدا زۆربەئاسانی هات و چۆبکات و،هەموویان ڕێنومایی بکەن.

هەروەکو خۆی بۆمان دەگێڕێتەوە، ئەو ماڵانەی بەجوڵەی بەردەوامی خۆی پڕکردبوو، و بەیاری کردن و چالاکییەوە یاری و بازبازێنی تێدا دەکردن و دەگەیشتە سەقفی ماڵەکانیان و دەستی پێوەدەگرتن[1]، حەسەن بەردەوام لەو کەش و هەوا خۆشەدا گۆڕانی بەسەردا دەهات، بەرەوشتی بەرزو پاك و ڕەونەقداری پێغەمبەرانەﷺدەرازایەوە، لەوسەرچاوە زوڵاڵ و شیرینەی دەخواردەوە کە لەماڵەکانی دایکانی ئیمانداراندا پەنگی خواردبووەوە.

---

[1]– ماڵەکانی دایکی ئیمانداران ئەوەندە سادەو ساکارو نزم بورن کە حەسەن بەو شێوە بۆمان باس دەکات، دەستی لەسەقفی ماڵەکانیان گیرکردبوو.

وەك قوتابیەك لەسەر دەستی هاوەڵە گەورەو بەڕێزەکان لە مزگەوتی پێغە مبەردا پێگەیشت ﷺ. هەروەکو خۆی دە گێڕێتە وە دەربارەی: (عوثمانی کوڕی عە فان،عەلی کوڕی ئەبوطالب، ئە بو موسای ئە شعەری، طە لحە ی کوڕی عوبیدوڵلا، عەبدوڵلای کوڕی عومەر، عەبدوڵلای کوڕی عەباس، ئەنەسی کوڕی مالیك، جابیری کوڕی عە بدوڵلا،عیمرانی کوڕی حصەین، موغیرەی کوڕی شوعبە، عەبدوڕەحمانی کوڕی سەمرە، سەمرەی کوڕی جوندوب، ئەبی بەکرەی ثەقەفی، نوعمانی کوڕی بەشیرو جوندبی بەجەلی وهی ترو هی تریش...) خوای گەورە لە هەموویان ڕازی بێت. بەڵام لە هەموویان زیاتر هۆگرو ئالودەبوو بە ئەمیری ئیمانداران (عەلی کوڕی ئەبو طالب) (خوای لیّ ڕازی بێت) وە زۆر خۆشیدەویست. بەهێزی و خۆگری لەسەر ئایینەکەی، وە چاکی لە بەندایەتیداو دنیانەویستی و پشتکردنە جوانی و ڕازاوەییەکەی دنیا لەوەوە فێربوو.. پابەندی شەیدایی وڕۆشنایی لەگوفتارداو داناییەکی پێگەیشتوو، وتە زانستیەکانی و ئەوئامۆژگاریە بەهێزانەی دڵیان دەهێنایە لەرزە.هەموو لەو هاوەڵە بەڕێزە وەرگرتبوو...

لە تەقواو خوا پەرستیدا ڕەوشت بەرز بوو بەڕەوشتی ئەو...لە ڕوون کردنەوەو زمان پاراویدا شوێن پێی ئەوی هەڵگرت... بە لێ، پێشەوامان حەسەن لە مەدینەی شاری پێغەمبەردا(ﷺ)گەرەبوو، قورئانی پیرۆزی لەسەردەمی خەلیفە (عوثمانی کوڕی عەفان)دا لەبەرکردووە. کاتێك حەسەن بچووك بوو دایکی دەیبرد بۆ لای هاوەڵان تا دوعای خێری بۆبکەن،یەکێك لەو هاوەڵانە (عومەری کوڕی خەطاب) بوو خوای لیّ ڕازی بێت، دوعای بۆکردو فەرمووی: خوایە شارەزاو تێگەیشتووی بکە لە ئاییندا ولای‌خەڵك خۆشەویستی بکە.

دوای ئەوە حەسەن بووە شارەزایەکی شەرعزان وخوای گەورە تێگەیشتنێکی جێگیری لەقورئانی پیرۆزدا پێ بەخشی و خۆشەویستی کرد لەلای خەڵکخۆشەویستی کرد.زۆر هاتوچۆی ئەبو هورەیرەو ئەنەسی کوڕی مالکی دەکردو لای ئەوان فەرموودەکانی پێغەمبەری ﷺ لەبەردەکردو هەرکات فەرمووده‌یه‌كی لە خۆشەویستەوە دەبیست، ئیمان و لەخواترسانی زیاتر دەبوو...

تا وایلێهات لە خوا پەرستی و صۆفییەتیدا ببوە پێشەوای شوێنکەوتووان وئامۆژگارو بانگخوازیان بوو..

بۆ زۆر لە کێشەو گرفتی ئەو مەسەلانەی زانایان ڕای جیاوازیان سەردەبوو دەگەڕانەوە لای حەسەن ..ئەوەتا پرسیار لە ئەنەسی کوڕی مالك دەکەن، بەڵام ئەنەس دەفەرموێت:

وەڵامی ئەو پرسیارە لە حەسەن وەربگرن چونکە ئێمە بیستومانەو لەبیرمان چووەتەوە بەڵام حەسەن بیستوویەتی و لەبیری ماوە[1].

---

[1]-(صورة من حياة التابعين) للدكتور عبدالرحمن رأفت الباشا، و چەند سەرچاوەیەکی تریش. بەڵام وەکو تێبینی// " ئەنەس (خوای لێ ڕازی بێت) یەکێکە لەهاوەڵانی پێغەمبەر" درووودی خوای لەسەر بێت" بۆماوەی دە ساڵ لەخزمەتی دابووە، ...." هاوەڵانیش بەگشتی زۆر سووربوون لەسەر فێربوونی زانست و بۆچوونەکان و سوودلێوەرگرتن و گەیاندنیان، لێر چۆن لەبیریان دەچێتەوە، بەڵام ئەوە دەگەڕێتەوە بۆچەند هۆیەك لەوانە: أ-خۆبەکەم گرتنی ئەوهاوەڵە بەڕێزە لەڕووی زانست و زانیاری و دەربڕین لەبەرانبەر هاوەڵان و شوێن کەوتوان و خۆدەرنەخستان و.... هتد

ب-زانایی و دانایی حەسەنی بەصری بەو ڕادەیە کەهاوەڵان بەو جۆرە متمانەیان پێ بووەو پشتیان پێ بەستووە.

ج-بەگەورەزانین و بەرێزەوە سەیرکردنی هاوەڵان و شوێنکەوتوان و زانایانی ئەو سەردەمە لەلای یەکتری. ( نووسەر )

کاتێك حەسەن تەمەنی چوارده بەهاری تـەواو کـرد لەگـەڵ دایـك و باوکیدا گواستیانەوه بۆ بەصرەو لەویّ لەگەڵ خێزانەکەیـدا جیشـتەجیّ بـوون، لێرەوه نازناوی بەصرەی لێنراو لەناو خەڵکیدا بەحەسەنی بەصری ناسرا.

## حەسەن لە بەصرەدا:

بەصره لەو ڕۆژو سەردەمەی حەسەنی لیّ بوو، قەڵایەك بوو لەگـەورەترین قەڵایانی زانستی لەدەوڵەتی ئیسلامدا.

مزگەوته گەورەکەی شەپۆلی دەدا لەوانەدا بۆی دەچوون لـە گـەوره هـاوەڵان و شـوێنکەوتووه شـکۆدارەکان، کـۆڕو کۆبوونـەوه زانسـتیەکانی بەجۆرەها شێوه حەوشەو نوێژگەی مزگەوتەکەی ئاوەدان دەکردەوه.

حەسەن وابەستەی مزگـەوت بـوو، لـەکۆڕی (عەبـدوڵڵای کـوڕی عەباس)دا[1] دادەنیشت و تەفسیرو فەرموودەو خوێندنەوەکانی لەو وەردەگرت و فێری دەبوو، هەتا زۆر بەزوویی بوو بـە زانایـەکی شـارەزاو شـەرعزان و بـاوەڕ پێکراو، خەڵکێکی زۆر بەرەو لای دەهاتن و لەو هەمووه زانسـت و زانیاریـەی ئەو پاراو دەبوون.

بەدەوریا کۆدەبوونەوەو گوێیان شل دەکرد بۆ ئامۆژگارییەکانی کـە دڵـی ڕەقیان نەرم دەکردو فێرمێسکیان لەچاوان دەباراند، داناییەکەی کـاری لـەدڵی ژیرو تێگەیشتووەکان دەکردو لێی وورد دەبوونەوه.

پـەیڕەوی ژیـان و ڕێـڕەوی ئـەویان دەکـرد کـە خۆشـتربوو لەبڵاوبوونەوەی بۆنی میسك ...

[1] – عەبدوڵڵای کوڕی عەباس: زاناو عابدی ئومەتی محمده ﷺ.

## بەرزبوونەوەی لەناو خەڵکیدا

ئەو هەموو کاروبارەو هۆکاری زۆری تر هەبوون کەخوای گەورە بەهۆیانەوە حەسەنی لەناو خەڵکیدا بەرزکردەوە ، هەرچەندە خاوەن بنەماڵەیەکی بەرزنەبوو، بەڵام زانست و ویقارو تەقواو دڵسۆزی ئەویان بەرزکردەوە، بەشێوەیەك کاربەدەستان داوای ئامۆژگاریان لێدەکردو ئەویش ئامۆژگاری دەکردن، ڕاوێژیان پێدەکردو داوای ووتەو قسەی خێریان لێدەکرد ئەویش باسی بۆدەکردن و وەڵامی پرسیارەکانی دەدانەوە.

لەبەرامبەر ئەوەدا بەخشش و خەرجیان بۆ دەنارد، ئەویش لێی وەرنەدەگرتن و سەرزەنشتی دەکردن، ئەو پارەوخەرجی لە هیچ کەسێك وەرنەگرتووەو شیعاری ئەو ﴿إِنْ أَجْرِيَ إِلاَّ عَلَى اللّهِ﴾[1] بوو، کە ئەوە چاکترینی کرێیە، بەڕاستی دڵنیاو بەقەناعەت و ئاسوودەبوو، بەم جۆرە ببوە چاکترینی پیاو.

## پلەو پایەی زانستی و هۆکارەکانی:

حەسەن (خوای لێ ڕازی بێت)، زانستگایەك بوو بۆ زاناو شەرعزانان، جێگای باوەڕبوو، پشتی پێ دەبەسترا و جێگای متمانەبوو، بەڵگەیەکی سەرڕاست و زمان پاراو بوو، لەڕووی زانست و زانیاریەوە بە گەورەی ئەهلی سەردەمیخۆی دادەنرێت و لەڕووی کردەوەو ڕەفتاریەوە، بەهێزترینیان بوو لەڕەوانبێژی و ڕوونکردنەوەدا.

---

[1]- هود/٩ ، واتە: (کرێ و پاداشتم تەنها لای خوایە).

بەڕاستی لەئامۆژگاریو ووتار و تەفسیردا کاراو لێزان و چالاك بوو بەو هەموو سەلیقە جوان و لێهاتوویەوە ببوە سوارچاکی مەیدان، ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ چەند هۆکارێك لەوانە:

* گەورەبوون و پێگەیشتنی لەماڵی دایکی ئیمانداران (ئوم سەلەمە) و شیرخواردنی لە مەمکی ئەو، هەروەکو شیرە خۆرەی زانست و شەرعزانیەکەشی بوو.

* نزیکی لەماڵەکانی تری دایکانی ئیمانداران، کە لەوانەوە فێربوو، وبوو بەو بانگخوازە.

* پەیوەست بوونی بەکۆڕو دانیشتنەکانی ئیبن و عەبباس (خوای لێ ڕازی بێت) و لەوەوە شەرعزانی و فەرموودەو تەفسیرو زمان و خوێندنەوەکان فێربوو.

* شەیدایی و خۆشەویستی بۆ ئەمیری ئیمانداران (عەلی کوڕی ئەبوطالب)-خوای لێ ڕازی بێت- کە چاودێری کردو بەهێزی و پێداگری و چەسپاوی لەدینداو چاکەکاری ولەبەندایەتیدا و پشتکردنە دنیاو بەهێزی لەپاراوی زمان و ڕوونی لەقسەکردندا لەوەوە فێربوو.

* زۆرێك لەهاوەڵە بەڕێزەکانی بینیوەو دەربارەیان گێڕانەوەی بووە، لەوانە: (عیمرانی کوڕی حصەین، عەبدولڕەحمانی کوڕی سەمرە، نوعمانی کوڕی بەشیر، جابر، ئیبنو سەریع، ئەنەس، عثمان، طلحة) خوا لەهەموویان ڕازی بێت.

بۆ خۆی دەفەرموێت: (٧٠) لەو پیاوە چاکانەم بینیوەو ناسیوە کە لەجەنگی بەدردا بەشداربوون.

## خواناسی و دنیا نەویستی:

حەسەنی بەصری -خوای لێ ڕازی بێت- بەڕاستی دنیانەویست بوو بەجۆرێك لەدنیادا دەژیا کەهەر بیری لێ نەکردۆتەوەو گوێی پێ نەدەدا، هەرگیز بەجوانی و ڕازاوەییەکەی سەرقاڵ نەبووەو بەدوای ماڵ و سامانیدا وێڵ و بەهەڵپەنەبووە، بەڕاستی لەچاکترینی بەندە چاکەکان بوو، هۆگری خەم و پەژارە بووە، لەخەوو بێ بەری ئەوەندە نەبێ پێی بژی، شەرع زانێکی خواناس بوو، خواپەرستێکی گەرم و گوڕ بوو.

لەم بارەیەوە دەفەرموێت: بڕوادار بەخەفەتەوە ڕۆژدەکاتەوەو بەخەفەتەوە ئێوارەی لێ دێت، بەوخەم و خەفەتەی بەوپەڕی بڕوا پێبوونەوە دەیخوات گۆڕانی بەسەردا دێت، بەجۆرێك بە بەشی بزنۆکەیەك ڕازی دەبێت، بەخورما و چۆڕێك ئاو قەناعەت دەکات.

حەسەن هەڵگری میراتی محمەد(دروودی خوای لەسەر بێت) بوو، لەو کەسانە بوو کە لەسەردەمی خەلیفە(عثمانی کوڕی عەففان)-خوای لێ ڕازی بێت-قورئانیان کۆکردۆتەوە.

(الذهبی)دەگێڕێتەوە کەفەرموویەتی :من لە "یوم الدار"چواردە ساڵان بووم قورئانم کۆکردۆتەوە و چاوم لە (طلحە ی کوڕی عوبەیدوڵلا)-خوای لێ ڕازی بێت- دەکرد.

زۆرینەی هاوەڵان کاریگەریان لەسەر حەسەن درووست کردووەو هەر زۆر زوو هەوڵی داوە بۆ وەرگرتنی زانیاری، و لەو سەرچاوە هەڵقوڵاوە زانستی یەی هاوەڵانی خواردۆتەوە کە بۆریچەو کارێزی زانست و هوشیاری و زانیاری بوون.

(محمد بن سعد) لە (طبقات)دا دەفەرموێت:

حەسەن-رەحمەتی خوای لێ بێت- زانستگایەك بوو، زانا، بەرز و بەشکۆ، شەرع زان، جێگەی باوەڕ، متمانە پێکراو، خواپەرست، دینداری‌کی خێردار، خاوەن زانیاریەکی زۆر، زمان پاراو، جوان و شۆخ و شەنگ ...

زانایان دەفەرموون: ئەم پێشەوا بەرزو پیرۆزە زانست و کردەوەی پێکەوە کۆکردبووەوە، هەتا وای لێ هاتبوو ببووە لوتکەو سەرکردەی شوێن کەوتووان، بەگەورەی خەڵکی سەردەمی خۆی دادەنرا هەم لە زانست و هەم لەکردەوەدا.

بەڵام لایەنی کردەوەی قورسترو باشتربوو لەلایەنی زانستی یەکەی، ئیبن و عیماد دەڵێت: بە(یونس کوڕی عوبەید)یان گوت: کەسێك دەناسیت وەك حەسەن کاربکات؟

فەرمووی: وەڵڵاهی کەسێك ناناسم قسەیەك بکات وەك قسەکانی ئەو، ئیتر چۆن کرداریان وەك کرداری ئەو دەبێت؟! ...

ئینجا لەوەصفی دا دەڵێت: کەپێی دەگەیشتیت وات دەزانی تازە خزمێکی ناشتوە، کەدادەنیشت وەك ئەسیرێك وابوو کەفەرمانی خنکاندنی درا بێت، ئەگەر باسی ئاگردەکرا وەك ئەوە وابوو کە ئاگر تەنها بۆئەو دروست کرابێت !! ...

لەگەڵ ئەو هەمووعیبادەت گوێڕایەڵیەش کەهیبوو و لەبەر ئەو هەموو ترسەی لەخوای گەورەو سزای خوا هەیبوو، وشك و سڕبوو بوو،

ئیمام(المناوي) لە(الطبقات) دا دەڵێت:"حەسەن ببووە سەرکردەی بەندە هەڵبژێردراوە باشەکان، بۆماوەی چل ساڵ نوێژی بەیانی بەدەست نوێژی عیشاوە کردووە.!!

شوێن کەوتوان دەڵێن: حەسەن لە هاوەڵە بەڕێزەکان دەچوو، (علی کوڕی زەید)دەفەرموێت: گوێم لە (ئبن و موسەییەب)و(عوروە لقاسم)و زۆری تریش بووە گوتوویانە : کەسمان نەدیوە وەك حەسەن بێت، ئەگەر لەسەردەمی هاوەڵاندا بوایەو هاوتەمەنیان بوایە ئەوان هەرگیز پێشی نەدەکەوتن، لەگەڵ ئەوەشدا حەسەنی بەصری لەلوتکەی خۆبەکەم زانیندا بووە، لەبەرامبەر هاوەڵاندا خۆی زۆربە کەم گرتوە، بەجۆرێك دەفەرموێت: بەڕاستی کەسانێکم بینیوەو ناسیوە، من لەناویاندا هیچ نەبووم، بەڵکو تەنها دزێك بووم.

زۆری چاو لەو پیاوە چاك و پاکانە دەکرد کەلەسەر دەستی پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێت)پەروەردە بوو بوون، و لەچاویدا لەبەندایەتی و وازهێنانیان لەدنیا زۆر بەرزو بلند بوون.

دەفەرموێت:"قەومێکم ناسیوە لەماڵەکەیاندا لەیەك دەست جل زیاتریان نەبووە، هەرگیز لەماڵی خۆیاندا فەرمانیان بەدروست کردنی خواردن نەکردووە، هیچیان لە ژێرخۆ یاندارانەخستوە" !! ..

ئیمام حەسەنی بەصری پێشەوایەك بووە لەگەورە پیاوان و پێشەوایانی شوێنکەوتوانی ڕێبازی تەصەووف[1] و زانستەکەی لەسەردەمی شوێن کەوتواندا.

---

[1]/تەصەووف: دکتۆر"زەکی موبارەك" لەکتێبی "التصوف الإسلامي"دا دەڵێت: تەصەووف لەخۆ بووردنەو بەستراوە بە دڵ و گیانەوە. "شێخ مەعروفی کەرخی"دەڵێت: تەصەووف پەیرەوی کردنە لە(حقایق)ودوورەپەرێزیی کردنە لەوشتەی بەدەستی خەڵکە.

"ئەبولحەسەنی نووری"دەڵێت:تەصەووف بریتی یە لەپاك کردنەوەی دەروون بەچەشنێك کەهەرگیز ناپاك نەبێتەوەو ناپاکی بۆنەگەڕێتەوەو زەبوونی و لاوازیی ڕووی تێ نەکاتەوە و دووری بگرێت لە ئارەزووی -نەفس-ونزیك بێت لە ئارەزووی-ڕۆحی-.

"ئەبو بەکری شیبلی"دەڵێت: تەصەووف بریتیە لەدانیشتن لەگەڵ خوادا بێ پێویستی هیچی تر.

"جونەید"دەڵێت: تەصەووف بریتی یە لەڕەوشتێکی چاك لە مرۆڤێکی چاك لە کات و زەمانێکی چاکدا بەرامبەر چاکان دەکرێت.

"سەمنوون"دەڵێت: تەصەووف واتە نەبیتە بەندەی کەس و کەسیش نەکەیتە بەندەی خۆت.

"شێخ محمد أمين الكردي-ئەربیلی" کەلەساڵی (١٩١٣ز)وەفاتی کردووە لە کتێبی(تنوير القلوب)دا دەڵێت: (شەریعەت)درەختە(تەریقەت)لق و پۆپەتی و (حەقیقەت)بەرهەمیەتی و (حەقیقەتیش)خواناسی یە لەڕێگەی دەروونەوە کە بریتی یە لە تەصەووف.

"ئەبو موحەممەدی جەریری"دەڵێت:تەصەووف پەیرەوی کردنە لەهەموو شتێکی پەسەند و دوورکەوتنەوەیە لە هەموو ڕەفتارێکی ناپەسەند.

"نوری" دەڵێت:تەصەووف بریتی یە لە ئازادی و سەخاوەت و جوامێری و خواپەرستی بە شەوق و مەیل و ئارەزوورەوە.

"ئیمام مالیکی کوڕی ئەنەس(٩٠-١٧٩ك)دەڵێت: ئەوەی پەیرەوی لە شەرع کردو پەیرەوی نەکرد لەتەصەووف ئەوە فاسقە، ئەوەش پەیرەوی کرد لە تەصەووف و پەیرەوی نەکرد لە شەرع ئەوە بێ دینە، ئەوەش پەیرەوی کرد لە شەرع و پاشان لە تەصەووف ئەوە گەیشتووەتە ئەوپەڕی باوەڕ ".

بڕوانە: دانراوی :(تەصەووف چی یە)ی ئەمین نەقشبەندی..

"کەئەوە لە (حلیة الأولیاء)یئەبو نەعیم و(صفوة الصفوة)ی ئیبن وجەوزی و(طبقات الکبری)ی ئیمامی شەعرانی و(الکواکب الدریة)ی ئیمامی مەناوی و(طبقات النساك)ی ئەبو سەعیدی کوڕی الاعرابی و(سیر أعلام النبلآء)ی الحافظ الذهبی و زۆری تریشدا باسیکراوە".

(ئیبن و عەرەبی) دەڵێت: حەسەنی بەصری لەلای ئێمە لەپێشەوایانی ئەهلی تەریقەتی خوایە-جل جلالە-.

(تاج الدین الکلاباذی) ئیمام حەسەنی بەیەکێك لەپەیڕەوانی ئەهلی تەصەووف داناو، و هەموو مێژوونووسانی تەصەووف(ئیمام حەسەن)یان بەتەنیا جیاکردوەتەوە بەجوامێرترین گەورەو هەڵبژێردراویان داناوە لەگەورەی پەیڕەوانی ئەم ڕێبازە.

بەگشتی کەباسی خواناسان دەکەن، (ئیمام حەسەن) بەنموونە دەهێننەوە و گوێ بۆ ووتەکانی دەگرن، لێی دەگێڕنەوە کە شارەزاییەکی تەواوی لەو مانا تایبەتییەدا هەبووە.

لەماڵەکەی خۆیدا زنجیرە کۆڕو دانیشتی تایبەتی هەبووە کەتیایدا تەنها باسی لەمانای زوهدو خواناسین و زانستی شاراوەی دەروونی تیادا کردووە و باسی هیچ شتی تری تیانەکردووە، ئەگەر کەسێك لەو کۆڕو دانیشتنە تایبەتیەیدا پرسیارێکی جگە لەوانەی لێ بکردایە پێ ی بێزاردەبوو، دەیگوت: ئەوە ئێمە لەگەڵ براکانمان بە تەنیا کۆبوینەوە زیکر دەکەین.

وەلە مزگەوتیش زنجیرە دانیشتنێکی هەبووکەتیایدا باسی (فەرموودە)و زانستی(شەرع)و زانستی(قورئان)و (زمان)و زانستە پێشکەوتووەکانی تری

دەکرد، ئەگەر لەوێدا پرسیاریان دەربارەی (تەصەووف) لێ بکردایە وەڵامی دەدانەوە، لەناو ئەوانەدا هەبوو بۆ خوێندنی (فەرموودە) هاتبوو، هەبوو بۆ (قورئان و ڕوونکردنەوەی) یان بۆ (ڕەوانبێژی) یان بۆ (دڵسۆزی) یان بۆ (زانستی تایبەت) هاتبوو، وەکو(عمرو بن عبید)و (ئەبو جەهیر)و (ئەبو عوبەیدەی ئەلناجی)و (عەبدوڕ ڕەحمانی کوڕی زەید)و (صالح المەری) و (شمیط)و زۆری تر.. کە هەریەکێك لەوانە ناوبانگی لە بەندایەتی و خواناسیدادەرکردبوو.

(حافظ الذهبی)و (ئەلمەناوی) لە (قەتادە)وە دەگێڕنەوە کە حەسەنی بەصری لە سەردەمی خۆیدا یەکێك بووە لەو چەند کەسەی کەهاوشێوەی (خلیل الرحمن)[1] بوون وەبەهانای خەڵکەوە چوون و فریایان کەوتوون و خەڵکی بەهۆیانەوە پاراوبوون وسەرکەوتووبوون.

بەلێکدانەوەی زۆرینەی زانایان و مێژوونووسان ئیمامی حەسەنی بەصری بە لووتکەو سەرکردەی شوێنکەوتوان دادەنرێت و باشترین کەسێکە لەدوای هاوەڵە بەڕێزەکان بەگشتی.

ئیمام حەسەن بەبنەچەی ڕێڕەوی (تەصەووف)دادەنرێت، بەرامبەر ئەوانەی کە دژی ئەم ڕێڕەوە بوون، چونکە وای بۆ دەچوون ئەمە دەرچوونە لەبازنەی ئیسلام ئینجا بەهۆی نەزانییان بوو بەڕاستیەکانی ئەم زانستە یان هەر بیرکردنەوەیەکی‌تر، لەکاتێکدا کە ئیمام حەسەنی بەصری تەمەنی پیرۆزی هەموو لەسەدەی یەکەمی کۆچیدا بەسەر بردووەو هاوچەرخی گەورە هاوەڵان بووەو هەموویانی چاوپێکەوتووە.

حەسەنی بەصری ئاوخۆرگەی پابەندی بەم ڕێڕەوە لەمێرگی خەلیفەی چوارەم (علی کوڕی ئەبوطالب) -خوای لێ ڕازی بێت- وەرگرتبوو.

---

[1]/خلیل الرحمن: حەزرەتی ئیبراهیم.

کە ئەمە ئەوە دەچەسپێنێ ئـەم ڕێـڕەوی(تەصـەووف)ە دەگاتـەوە بـە پێغەمبەر(ﷺ) ئینجا خەلیفەکانی ڕاشیدین هەموویان، لێرەدا بانگـەوازی ئەوانـە تێکدەشـکێت کـە دەڵـێن (تەصـەووف) داهێنـراوە (بیدعـە) یـەو لەسـەردەمی پێشینەکاندا نەبووە، بـەڵکو (تەصـەووف) متمانەیـەکی تـەواوی بەدەستهێناوەو ماناکەی پێکاوە چونکە لەڕاستیەکانی خودی ئیسلامەوە هەڵقوڵاوە.

ئیمام حەسەن ناوی پەیڕەوانی ئەم ڕێڕەوەی بە(صـۆفی)[1] نـاوبردووەو یەکەم کەس بووە ئەم ناوەی بۆ داناوە، وەکو زاراوەیەکی زانستی، ئەوانـە ئـەو خواناسە خێردارانە بوون لەپەیڕەوی ئەم ڕێبازەدا بەگۆڕانکار دەناسران.

(ئیمام المناوی) لەشەرحەکەیدا فەرموودەیەك دەگێڕێتەوە:( زەوی بەتاڵ نابێت لـە چل پیاو کە هاوشێوەی حەزرەتی ئیـبراهیم بـن وەخـەڵکی بەهۆیانـەوە پاراو دەبن و بەهۆیانەوە سەردەکەون و یەکێکیان نامرێت هەتا یەکێکیتر جێگای دەگرێتەوە)[2].

سەعید دەڵێت: گوێم لـە قەتادە بوو دەیگوت: هیچ گومانێکمـان نییـە کە حەسەن یەکێکە لەوان، وە ئەوانە هەموو لەو کەسانە بوون کە یـەك بـەدوای یەکدا شوێنی یەکتریان دەگرتەوە.

---

[1] -صۆفی: لەکۆنداو هەر لەمێژەوە(خوری) واتە(صوف) بەرگ و پۆشاك و سیالی هەژاران و بێنەوایان بووە، هەرکەس ئەم بەرگەی لەبەرکردایە یان هەژار بووە یان زۆر(متواضع) بووە واتە(خۆبەکەم زانین)، ئەوەتا ئیمامی عومەر-خوای لێ ڕازی بێت- لەستایشی پێغەمبەردا(ﷺ) فەرموویەتی: باوکم و دایکم بکەمە قوربانت ئەی پێغەمبەری خوا.. تۆ بەرگی خوریت دەپۆشی و سواری گوێدرێژ دەبوویت ... هتد.

[2] - "لن تخلوا الأرض من أربعين رجلا مثل خليل الرحمن فيهم تسقون و بهم تنصرون، وما مات منهم احد إلا بدل الله مكانه آخر"

لەلای پێشەوایان و زانایانی ڕێڕەوی (تەصەووف) حەسەن بەیەکەم کەس دادەنرێت کە قسەی لەسەر زانستی (تەصەووف) کردووە و ڕێگەی بۆ ئاسانکردووەو زمانیان بەهۆیەوە پاراو و خۆش گوفتار بووە، قسەی لەسەر کردەوەو نوورو ڕۆشناییەکەیان دەرخستووەو دەمامکیان لەسەر لاداوە، کەپێیان دەوو(ئەبو سەعید) تۆ قسە لەزانستێك دەکەیت زووتر لەبراکانتمان نەبیستووە، تۆ ئەوانەت لەکوێ هێناوە؟ دەیفەرموو: لە(حوزەیفەی کوڕی یەمان).

(أبو طالب المكي) لە (قوت القلوب)دا دەڵێت: حەسەنی بەصری پێشەوامانە لەو زانستەی کەقسەی لەسەر دەکەین و پەیڕەوی ڕێبازەکەی دەکەین و لە چراکەی ڕووناکی وەردەگرین.

ئەوەمان بە فەرمانی خوا وەرگرتووە لەپێشەوا بەپێشەوا هەتا لەکۆتایدا گەیشتووەتەوە ئەو و ئەویش لەچاکترینی شوێنکەوتووانە بەدڵنیاییەوە.

ئیمام حەسەنی بەصری ڕواڵەتی (صۆفی) لەنێوان لەبەرکردنی (صوف)–خوری– و لەنێوان ڕاستیە شاراوەکانی ناو دەروونیدا بەیەکەوە دەبەستێتەوەو دەفەرموێت: " هەرچی خوری لەبەربوو نیشانەی باشی ئەو کەسە نیەو نابێت بە(صۆفی) چونکە صۆفی پێویستی بەچاکی و پاکیەتی و هەستکردن بەچاودێری خودایی هەیە".

ڕۆژێك لێیان پرسی بۆچی بەرگی خوریت لەبەرکردووە؟

بێدەنگ بوو هیچ وەڵامی نەبوو. گوتیان: وەڵامت نەداینەوە، بۆ؟

فەرمووی: ئەگەر بڵێم زوهدە ئەوە خۆهەڵکێشانە، وە ئەگەر بڵێم نەبوونی و هەژاریە ئەوەدەبێتە شکات لە پەروەردگارم.

ئەو سیپاڵی خوری لەبەردەکردو ئەوەش لەئیمامی (علی کوڕی ئەبو طالب)ەوە، چونکە ئیمامی عەلیش سیپاڵی خوری لەبەرکردووە.

دکتۆر(ئیحسان عەبباس) یەکێکە لەوانەی نوسینێکی تەواوی لەسەر نوسیوەو جیای کردوەتەوەو ڕێبازی (تەصەووف)ی جوان ڕوونکردوەتەوە لە سێ لقدا کۆی کردوونەتەوە کە دکتۆر(عەلی سامی ئەلنەشار)یش هاوڕایە لەگەڵیدا بەم شێوەیە:

**لقی یەکەم:** لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) دەستپێدەکات بۆ(حەسەنی بەصری) ئینجا بۆ ئیمام (الحارث المحاسبی) ئەم زنجیرەیە بڵاوبووەوە لە باکوری ئەفریقا بەتایبەتی، ئەم زنجیرەیە بۆتە جێگای سەرنجدان و تێڕامان و بەڕێبازی (حەسەنی بەصری) ناسراوە.

**لقی دووەم:** لە پێغەمبەرەوەﷺ بۆ (علی کوڕی ئەبو طالب)ئینجا لەوەوە بۆ(حەسەنی بەصری)، ئینجا بۆ(حبیب العجمی) بۆ (داودی طائی) بۆ (شێخ مەعرووفی کەرخی) بۆ (سری سەقەطی) بۆ (جونەید) کە نازناوی (گەورەی

هۆزی صۆفی یەکان)ی لیٚ نراوە، ئـەم لقـە بـەرێبازی نەقشـبەندییەکان کۆتـایی دێت.

لقی سیٚ یـەم: لــە پێغەمبــەرەوەﷺ بـۆ (ئەنەسـی کـوڕی مالــك) ئینجـا بۆ(حەسەنی بەصری) لەوەوە بۆ (فرقد السبخي) لــەوەوە بـۆ (شـێخ مـەعرووفی کەرخی) ئینجا بۆ هەمووان.

ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کەئـەم رێـڕەوە داهێنـراو نی‌یـە وهـەڵقوڵاوی ئیسلام خۆیەتی، کە حەسەنی بەصری قسـەی لەسـەر زانسـتەکەی و پـەیڕەوانی کردووەو ناوی بۆ داناون.

حەسەن خواناسێکی زانا بوو، بەڕاستی پارێزکارو لەخوا ترس بوو، زۆر جار (کەرامات)[1] لەسەر دەستی بینراوە، ئەوەش دەردەکەوێت لەسەردەستی بەندەیەکی چاك و پابەند بەشوێن کەوتنی پێغەمبەر ﷺ وەهۆگری بەرنامەو

[1]- کەرامات: "موعجیزە، کەشف، کەرامات" بەلای ئەهلی سوننەوە لەیەك چوار چێوەدا کۆدەبنەوەو پێ ی دەووترێت(خرق العادة).

(خرق العادة)بەکارێك دەووترێت ئەنجام دانی ئەم کارە بەڕواڵەت لەووزەی کەسدا نەبێت، وەکوو زیندوو کردنەوەی مردوو بۆ(حەزرەتی عیسا" علیە السلام ") یان هێنانی تەختی مەلەکەی سەبا(بەلقیس) لە وولاتێکەوە بۆ وولاتێکی تر لەچاو تروکانێکدا بۆ حەزرەتی (سلێمان"علیە السلام")کە لەووزەی مرۆڤ بەدەرن، ئەمە ئەگەر پێغەمبەرێك"علیە السلام"کردی ئەوا "موعجیزە"یە ئەگەر پیاو چاکێك و خوا پەرستێك کردی ئەوا"کەشف و کەرامات"ە، بەڵام جیاوازی لەنێوانیاندا هەیە، موعجیزەکە بۆ پێغەمبەرانە"علیهم السلام" خاوەنی ریسالە و شەریعەتی تایبەتن ئەوە دەبێت هەمیشە ئەم موعجیزەیە دەرخات بۆ گەیاندنی پەیامەکەی، بەڵام خاوەنی کەرامات تێدەکۆشێت کەراماتەکەی بشارێتەوە تا بۆی بکرێت ئاشکرای نەکات مەگەر پێویستی یەتی هیدایەتی گومڕاو سەرلێشێواوێك ناچاری بکات، دەبێ بزانین کەشف و کەرامات غەیب زانین نییە، غەیب کەس نەیزانیوەو کەسیش نایزانێت، چونکە غەیب واتە: زانینی شتی نهێنی و داپۆشراو و پشت پەردە بە ئارەزووی خۆی لەداهاتوو و لە ڕابردوو، لەهەمان کاتدا، ئەمەش کەس نایزانێت و کەس ناتوانێت، بۆیە بەمەیان وتووە(کەشف-کەرامات) واتە هەرکاتێ خوا ویستی پەردەی سەرچاوی بەصیرەتی ئەوکەسە لادەدات و وەئەو شتەی پیشان ئەدات، هەتا لەژیانی پێغەمبەرانیش دەرەکەوێت کەئەوانیش غەیبزان نەبوون"قل لاأقول لکم عندی خزائن الله ولا أعلم الغیب ولا أقول لکم إنی ملك إن أتبع إلا مایوحی الی"الانعام ٥٠ واتە((ئەی محمد"دروودی خوای لێ بێت" پێیان بڵێ: من پێتان ناڵێم گەنجینەکانی خوا لای منە، هەروەها لەنهێنی و شاراوەکانیش هیچ نازانم و ئاگادارنیم و پێتان ناڵێم، بەڕاستی من فریشتەم، بەڵکو تەنها شوێنی ئەوە دەکەوم کەبە وەحی و نیگا پێم دەگات)) بڕوانە دانراوی : (تەصەووف چی یە)ی ئەمین نەقشبەندی.

شەریعەتەکەیەتی و خاوەن بیروباوەڕێکی ڕاستەقینەو کرداری باش و زانستی پێ هەبێت، یانا. هەندێ جار بە (وەلی) ناودەبرێت، واتە خواناسێکی خێردارو خاوەنی هەموو سیفاتە باشەکان لەسنووری توانای خۆیداو بەردەوامە لەسەر گوێڕایەڵی و دوورکەوتنەوە لەسەر پێچی فەرمانی خوا، دژی خۆ خەریککردنە بەڕابواردن و هەواو هەوەس و هەتا لە حەزە ڕێگە پێدراوەکانیش خۆی دەگرێتەوە.

**لەو کەراماتانەی سەرچاوە باوەڕپێکراوەکان هێناویانە:**

- (مطر الوراق) دەڵێت: کەحەسەنی بەصری دەرکەوت و هات هەروەکو خۆی لەدوارۆژدا بێت هەواڵی دەدا بەوەی کەڕووی دەدا !! ..

- (ئیمام النبهاني) لە(جامع الكرامات)دا نوسیویەتی: کاتێك بەحەسەنیان ووت(حەجاج) (سەعیدی کوڕی جوبەیر)ی کوشتووە، دوعای لێکردو ووتی: خوایە ئەی شکێنەری زۆرداران (حەجاج)تێکبشکێنە، نەمایەوە تەنها سێ ڕۆژ دواتر ئەوەبوو خۆرەو کرم کەوتنە هەناوی و پێیان مرد.

- حەسەن یەکێك بووە لەوانەی کەهەر (پێنج) نوێژەکەی لە مەککە ئەنجامداوە لەکاتێکدا دانیشتووی بەصرە بووە، ئەوەش بەهۆی وێکهاتنەوەی زەوی بۆی.

- (ئیمام المناوی) لەشەرحی وەفاتیدا دەڵێت: زۆر لەپیاوچاکان لەشەوی وەفاتیدا بینیویانە، دەرگاکانی ئاسمان کراونەتەوە بانگکارێك بانگی دەکرد: وا حەسەن گەڕایەوە بۆلای خوا خوایش لەو ڕازیە.

• (حافظ الذهبی) لەلێکۆڵینەوەکەیدا لە(مطر الوراق)ەوە بۆمان دەگێڕێتەوە: ( دەگێڕنەوە کەئیمامی حەسەن بێ هۆشیەکی بەسەرداهات دواتر کەهاتەوە هۆش گوتی: بەڕاستی بەئاگاتان هێنامەوە لەبەهەشت و سەرچاوەو پلەو شوێنی ڕێزداران بووم).

• حارثە فەرموویەتی: کە حەسەن فەرمووی: (.. من بەشێوەیەکم چاوم لە ئەهلی بەهەشتە کەتیایدا دێن و دەچن و سەردانی یەکتری دەکەن وەگوێم لەهاوارو لوورەی ئەهلی ناو ئاگرە).

پێغەمبەری خواش ﷺ دەفەرموێت: (زانیم کەدڵی بڕوادار بەنووری خوا ڕووناك بوونەتەوە).

## ئەو ڕاستیانەی کە ئیمامی حەسەنیان گەیاندە بەرزترین لووتکە

ڕەحمەتی خوای لێبێت لەسەردەمی شوێنکەوتواندا گەیشتە بەرزترین لووتکە،، ئەو بەرنامەیەی ئەوی پێگەیاندو ئەو مەقامە بەرزەی پێدا چەند بنەماو هۆکارێك بون کەئەمانە هەندێك لەوانەن:

١) بنەمای زانست و زانیاری: کە ئەمە بنەماکانی تریشی لەسەر درووستبورن چونکە بەبێ بوعدێکی فیقهی و تێڕوانینی و بیرکردنەوەیەکی توند و دامەزراو لەڕاستی و کاروباردا، زوهدو ترس و کردار ئەنجام نادرێن، ئیمام حەسەن لەسەردەمی خۆیدا تاقانە بووە لەزانست و زانیاریدا.

– (عـوف)دەڵێـت: پیـاوێکم نـەبینیوە لـە حەسـەن زاناتربێـت بـەڕێگای بەهەشت.

– (الحافظ الذهبي) دەڵێت: گەورەی سەردەمی خۆی بـووە لـەزانسـت و کردەوەدا.

– قـەتادە دەڵێـت: کەسـێکم نـەدیوە وەك حەسـەن ڕاو بۆچـوونی لـە ڕاوبۆچوونی (عومەری کوڕی خطاب) بچێت.

٢) بنەمای زوهدو دنیا نەویستی: شتێکی ڕاسـت و نکـوڵی لێ نـەکراوە لەلایـەن گشـت زانـاو توێـژەرەکان ئیمـام حەسـەن دامەزرێنـەری قوتابخانەی(زوهد)بووە لەسەردەمی شوین کەووتواندا، (عەلقەمەی کوڕی مرثـد) دەڵێـت: هەشـت کـەس لـە شـوێنکەووتوان گەیشـتبوونە چـڵەپۆپەی زوهـدو دنیانەویستی لەناو ئەوانیش حەسەن لووتکەیان بوو، کەسمان نەدیوە لـە حەسـەن خەمبارتر.

٣) بنەمای ترس و خەفەت: ئیمام حەسەن بەڵگـەی نموونـەیی بـوو لـەو هەمزو خەمگینیەی و ترسان لەخواو ملکەچـی و فەرمانبـەرداری خـوادا، هـەتا (یەزیدی کوڕی حوشـب)دەڵێـت: کەسـم نـەدیوە وەکـو(حەسـەنی بەصـری و عومەری کوڕی عبدالعزیز) لەخوا بترسن هەروەکو ئـاگر تـەنها بـۆ ئـەو دوانـە درووستکرابێت، (یوسف کـوڕی ئـە سـباط)دەڵێـت: لەگـەڵ حەسـەندا ژیـاوم بۆماوەی(٣٠) ساڵ پێنەکەنیوەو گاڵتەو گەپیشم لێ نـەدیوە بۆمـاوەی(٤٠)سـاڵ ئیمام حەسـەن وا دەبینێـت کـەترس و خەفـەت هـەردووکیان بەرهـەمی چـاکی دڵەکانن.

٤) بنەمای بەندایەتی و شـارەزایی وزانسـتی شـەرع: ئیمـام حەسـەنی بەصری(ڕەحمەتی خوای لێ بێت) بەندایەتی و شارەزایی زانستی شەرع و زوهدی بەیەکەوە گرێدابوو واتە: هۆی بەهۆکارەوە بەستبوو.

دەیفەرموو: شەرعزانی دنیانەویست لەدنیادا هوشـیارو بەرچـاو ڕوونـە بەدینییەوە بەردەوامە لەسەر بەندایـەتی کردنـی پـەروەردگاری، وە دەیفـەرموو: کردەوەی بەردەوام لەسەر بنەمای پاکی نەفس و چاکی دڵ و تامەزرۆ بوونـە بـۆ بینینی خوا"جل جلالە".

ئامۆژگاریـەکانی لەسەر هاندانی بۆ کرداری باش کاری دەکردە سـەر دڵە زیندووەکان و وەك هەورە تریشقە بەئاگای دەهێنانەوە، دەیفـەرموو: سـەیرە کەسانێك هەن فەرمان دەکەن بەئامادەکردنی توێشوو بانگ دەکرێت لەناویانـدا بۆ ڕۆیشتن کەسەرەتاو کۆتاییەکـەی بەیەکـەوە بەنـدە، بـەڵام دانیشـتوون یـاری دەکەن !!

ئـەی نـەوەی ئـادەم: بەسـیەتی ئەزموونـەکان و گـۆڕانی ڕۆژەکـان و ئامۆژگـاری و بیرخسـتنەوەی مردنتـان بەسـە بـۆ قەدەغـەکردنتان لەسەرپێچـی فەرمانی خوا، ڕۆژەکان دەڕۆن و گوناهو تاوانـەکانتان بـۆ بـەجێ دەهـێڵن وەك ملوانکەیەك بەگەردنتانـەوە، گونـاهو تـاوان کۆتـت دەکـەن و لـەگوێڕایـەڵی و بەندایەتی دوورت دەخەنەوە.

(موبارەکی کوڕی فضالە) دەڵێت: ئاگام لێبوو لاوێـك هاتـە خزمـەتی حەسەنی بەصری و گوتی: ناتوانم شەونوێژ بکەم بەهیچ جۆرێـك، ئـەویش پێـی ووت: گوناهەکانت کۆتیان کردویت.

لەباسی گەورەیی عیبادەتی مزگەتدا دەفەرموێت:" مانەوە لەمزگەوتدا هۆكاری بەستنەوەیە بەگوێڕایەڵی خوا، خوای گەورە بەهۆی ئەوكەسانەی پابەندن بەمزگەوتەوەو بەهۆی دوعاو پاڕانەوەكانیانەوە بەڵاو نارەحەتی و كارەسات دوور دەخاتەوە لەسەر وولات و بەندەكانی".

## ویست و نیازی ئیمام حەسەنی بەصری بەهۆی عیبادەتەوە بۆ چ مەبەستێك بووە؟

ئایا چێژو خۆشگوزەرانیەكانی بەهەشت؟ بەڵكو ئامانجێكی بەرزترو پیرۆزتری لەوە هەبووە، ئەویش خۆشی و بەختەوەری بینینی خوایە، لەو بارەیەشەوە دەفەرموێت: "ئەگەر بەندەكان بزانن خوای خۆیان نابینن ئەوا دەمرن".

د. ئیبراهیم بەسیونی لەكاریگەری ئەو قسەیەدا دەڵێت: "ئەگەر خواپەرست مەبەستی بینینی خوابوو، ئەوا؛ نە بەهەشتە بەنازو نیعمەت و ژوورەكانیەوە و نە ئاگرە بەكڵپەو بڵێسەیەوە بەڵكو ڕوانین بۆ خۆشەویستی خوایە كەخواناسان هەموو تەمەنی خۆیانی لەپێناودا خەرج دەكەن".

بەڵێ، بینینی خوا هیواو ئومێدی هەموو ئەوانەن كە خۆشەویستیان بۆ خوایە، ئەوەتا ئیمامی حەسەن دەفەرموێت: "دڵخواز وەكو سەرخۆش وایە ئاسودە نابێت هەتا چاوی بە خۆشەویستەكەی نەكەوێت"، ئەوە ویست و نیازی هەموو ئەو مرۆڤە پاكانەیە كەدڵەكانیان پاك دەكەنەوە لە هەواو ئارەزوو بەهۆی چاكی كردەوەكانیان بۆ خواو ئازادبوونیان لە نەفس و شەیطان.

ئیمام حەسەن كە حەكیمی دڵەكانە دەڵێت: دەرمان و چارەسەری بۆ سەركەوتن بەسەر ئەو دوو دوژمنانەدا ئەوەیە: (بۆ سەركەوتن بەسەر وەسوەسەی"ئیبلیس"دا زیكرو قورئان خوێندنە، وەبۆ سەركەوتن بەسەر وەسوەسەی نەفسدا نوێژو ڕۆژوو وەرزش و تێ كۆشانە)، كە دڵ تەندروست بوو دەروون خاوێن بوو، ئەوا زۆر تامەزرۆو پەرۆش دەبێت بۆ گەیشتن بە پێغەمبەری خوا"دروودی خوای لەسەر بێت".

## بانگخوازی و كاریگەری لەسەر خەڵك

ئیمام حەسەنی بەصری هەرچەندە لەسەردەمی پێغەمبەردا ﷺ نەبووە، بەڵام لە پلەی هۆشیاری و خاوێنی شەرم و حەیا و پارێزكاری و ئاین خوازی و ژیری و دنیا نەویستی و خواناسی و بانگخوازیدا هەر لە هاوەڵان دەچوو.

زۆرینەی زانایان و پێشەوایان قسەیان لەسەر پلەی خواناسی و بانگخوازی و كاریگەرییەكانی ئەوكردووەو لێی دواوون.

* (عطا) دەڵێت: حەسەن پێشەوایەكی گەورەیە و شایانە بكرێتە مامۆستاو سەرمەشق بۆ شوێن كەوتن و چاو لێ كردنی.

* (حەمادی كوڕی زەید)دەفەرموێت: گوێم لە ئەیوب بوو دەیگووت: كە حەسەن قسەی دەكرد، قسەكانی هەر لە دوڕو گەوهەر دەچوون.

* (حەفصی كوڕی عومەر)دەفەرموێت: حەسەن دەگریا، لێیان پرسی چی دەتگریەنێت؟ گوتی: دەترسم سبەینێ فڕێم بدەنە ناو ئاگرو وازملێبێنن و لێم

بێئاگابن، ئینجا فەرمووی: " چی پاك و بێگەردترە لەو دڵەی بۆ خوایە؟ چی خاوێن ترە لەو دەروونەی بۆ خوایە؟ توخوا پێم بڵێن: ئایا ڕووحتان لەنوورو ڕووناکی دروست بووەو دەردەچن بەناو بەهەشتی پڕ لە حۆری دا دەگەڕێن؟ یا ژیان لەناو ئاگر بەسەردەبەن بەهەموو سزاو ناڕەحەتی یەکانییەوە؟!.. یا ئەوەتا هەڵگرو پۆشەری باوەڕێکی پڕ لەنوورو ڕۆشنایین (نور علی نور یهدی الله لنوره من یشاء)[1]. وە فەرمووی: "پاك و بێگەردی بۆ خوایە کەهیچ خوایەکی ترنییە جگە لە"الله" چی تۆ دەگۆڕێت؟؟ ئایا کتێبێك[2] هەیە جگە لەکتێبەکەی ئێمە؟ یا گیانێك جگە لەگیانی ئێمە؟ یا سەرزەمینێك جگە لەسەر زەمینی ئێمە؟ نا وەڵڵاهی، بەڵام دڵەکان گۆڕانیان بەسەردادێت... دەروونەکان دڵنیاو جەستەکان ئاسوودەو خۆشگوزەرانن بەڵام گوناهو تاوان دەیانگۆڕێت و خوو بە سەرپێچی و بێ فەرمانی خواوە دەگرن، تاوای لێدێت ئەوچەمك و وێنا باوەڕییانە نابینێت و هەست بەو دەرونە قورئانیە ناکات، تاوامان لێدێت، وەك هەژارێك بیردەکەینەوەکەتەنها دەوڵەمەندی لەبیرە، یان وەك نائومێدێك کەتەنها بیر لەخۆشی و بەختەوەری بەردەوام دەکاتەوە. کوا خەڵوەتی پیاوچاکان؟! کوا ویقارو ملکەچی باوەڕداران؟! کوا فرمێسکی تەوبەکاران؟! کوا خۆڕاگری لەخوا ترس و دنیانەویستان؟! لەکوێن ئەهلی ئیمان؟! زۆر پەرۆشم کە نایانبینم مەگەر لەکتێبدا، یان لەژێر خاکن!.(ئەبو سەعیدی ئەعرابی) دەفەرموێت:

---

[1] -نور ٣٥-واتە: "ئەو هیدایەت و ڕێنموونییە کە قورئانە ڕووناکییە لەسەر ڕووناکی، خواش هیدایەتی ئەوکەسە دەدات، کە دەیەوێت و شایستەیە بۆ لای نووری خۆی کە قورئانە".

[2] - مەبەست قورئانی پیرۆزە.

بەگشتی باسی بەندایەتیمان دەکرد وەك بیرخستنەوە، خەڵکی گوێیان بۆقسەکانی ئەو دەگرت و گوێرایەڵی زانست و وتەکانی بوون.

* پیاوێك پرسیاری لێکرد: ئەبو سەعید ئیمان چییە؟

فەرمووی: ئارامگرتن و لێبووردن و میهرەبانییە.

وتی: کام ئارامی و چ لێبووردنێك؟

فەرمووی: ئارامی لەسەر دەرنەچوون لەفەرمانی خوا، واتە: هەرگیز لەفەرمانی خوا دەرنەچێت.

وە لێبووردەیی و میهرەبانی لەسەر جێ بەجێ کردنی فەرزەکانی خوا، قەتادە ئەڵێت: زانستی حەسەنم لەگەڵ زانستی هەریەکێك لەزانایان بەراوردکردبێت، ئیللا زانستی حەسەن زیاتر و چاکتر بووە، دانەنیشتووم لەکۆڕو مەجلیسی هیچ زاناو بانگخوازو شەرعزانێك ئللا حەسەنم لەو پێباشتربووە، حەسەن بەرێزو بەشکۆ بوو زانایان لەپێش هەموو کەسدا شەرمیان لێدەکرد.

* (مطر الوراق) دەڵێت: حەسەن وەکو پیاوێك وابوو لەقیامەتدا بووبێت و ئینجا بێت قسەی لەسەر بکات، بەجۆرێك لەسەر هەرەشەو مەترسیەکانی دەدوا هەروەك لەوێ بێت و بەچاوی خۆی بیبینێت.

* (حمزة الأعمى) دەڵێت: زۆرجار سەردانی حەسەنم دەکرد لەماڵەکەی خۆیدا دەمبینی دەگریا، هەندێکجار کە دەچووم لە نوێژدابوو گوێم لەهەنسك و گریانی دەبو، زۆربەکوڵ دەگریا، ڕۆژێك پێم ووت: تۆ زۆر دەگریت، ووتی: کوڕم، بڕوادار چی کردووە ئەگەر نەگریەت؟! ئەی کوڕی خۆم گریان داواکاری ڕەحمەتەو فێری سۆزو بەزەییت دەکات، ئەگەر دەتوانیت بەدرێژایی تەمەن بگریت، ئەوا وابکە، بەڵکو ڕەحمت پێدەکات، ئینجا فەرمووی: ئەوەمان زانیوەو پێمان گەیشتووە: (هەرکەس لەترسی خوا بگریەت، خوا گەردنی لەئاگر ڕزگار دەکات پێش کەوتنی دڵۆپە فرمێسکەکانی). دەیفەرموو: کامە چاکەیە ؟ ئێمە پێدەکەنین و ناشزانین دەبینی خوای گەورە زۆر لەکردەوەکانمانی قبوڵ نەکردووەو پێمان دەفەرموێت: لێتان وەرناگرم.

بیربکەرەوە ئەی نەوەی ئادەم: ئایا تۆ هێزی شەڕت هەیە لەگەڵ خوادا؟ هەرکەس لەفەرمانی خوا دەرچێت ئەوا شەڕی لەگەڵدا بەرپا کردووە.

وەڵڵاهی حەفتا کەس لەبەشداربووانی (بەدر)م بینیوە، ئەگەر ئێوە ئەوانتان دیتبا دەتانگووت: ئەوانە بێ دراوو نەدارن! ..ئەگەر ئەوانیش لەچاکترینی ئێوەیان دیتبا دەیانگووت: ئەوانە بێ چاکەن و هیچیان پێ نیەو هیچ بەشێکیان نییە، وە ئەگەر لەخراپەکانی ئێوەشیان دیتبا دەیانگووت: ئەوانە هیچ باوەڕیان بەڕۆژی دوایی نییە.

* موسلیمی کوڕی ئیبراهیم دەڵێت: قاسم کوڕی فەضل بۆی باسکردین کە گوێی لە عمرو بن مرڕە بووە کە فەرموویەتی: بەڕاستی من خۆزگە بەخەڵکی بەصرە دەخوازم چەندە بەختەوەرن، کە ئەو دوو پیاو چاکە

لەوێدان (حەسەنی بەصری، محمد إبن سیرین)، هەتا جارێك پرسیاری دەربارەی مەسەلەیەك لە ئەنەسی کوڕی مالك دەکەن، ئەنەس دەفەرموێت: لەگەورەمان حەسەن بپرسن، گوتیان: ئەبو هەمزە ئێمە لەتۆ دەپرسین تۆش دەڵێیت: لە حەسەن بپرسن؟ فەرمووی لەگەورەمان حەسەن بپرسن، ئەو ئەوەی بیستووە کە ئێمە بیستوومانە، وە ئەوەی لەبیرە کە ئێمە لەبیرمان چوەتەوە..

* (ئەبو عەمرو ئەلعەلاء) دەڵێت: نەمدیوە کەسێك لەحەسەن قسە ڕەوان تر، لە حەجاجی یوسفی ثەقەفیان پرسی: کێ قسە ڕەوان و زمان پاراوترین کەسە؟ گووتی: حەسەنی بەصری زۆر بەپەرۆش و خەمخۆر بووە و زۆر لە خوا ترس و بەویقار بووە، (ئیبراهیم یشکری)دەڵێت: کەسم نەدیوە لە حەسەن پەرۆش و خەمبارتر، هەرکاتێك چاوت پێدەکەوت واتدەزانی تازە موسیبەتێکی بەسەردا هاتووە.

* لاوێك دێتە خزمەتی و دەڵێت: من سەرپێچی فەرمانی خوا ئەکەم و هەڵەو تاوان دەکەم، کەچی دەبینم خوا پێمدەبەخشێت، دنیای بەسەردا کردوومەتەوە، وە لەهیچ شتێك بێبەشی نەکردووم، حەسەن فەرمووی: ئایا هەڵدەستیتەوە بۆ شەو نوێژ؟

وتی: نەخێر ..

فەرمووی: ئەوەندە بەسە کەخوا لەگفتوگۆکردن لەگەڵ خۆیدا بێ بەشی کردویتا..

* پیاوێك هاتەخزمـەتی وگـوتی: ئەباسـەعید، سـكالای دڵڕەقـی خۆمـت لادەكەم، چارەم چیە؟

فەرمووی: بەیادی خوا نەرمی بكە، چۆن ئاگر قورقوشـم دەتوێنێتـەوە یادی خوا ئاوا دڵ نـەرم دەكـات و دەتوانێـت شـەیتان لـەخۆی دووربخاتـەوەو بیبەزێنێت.

دەفەرموێت: كەسانێكم بینیوە پشـتیان دەكـردە ئەوشـتانەش كـە خـوا بۆیانی حەڵاڵ كردبوو، زیاتر لـەو پشتكردنەی ئێوە لـەحەرامەكان، دەربارەی دنیا پرسیاریان لێكرد، لـەوەڵامدا فەرمووی: دەربارەی دنیاو دوارۆژ لێم دەپرسـن؟! نموونەی دنیاو دوارۆژ وەكو ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوایە.. كـەی زیـاتر لـەیـەكێكیان نزیك دەبیتەوە لـەوی تریان دوور دەكەویتەوە، پێم دەڵێن باسـی ئـەم ماڵـەم بـۆ بكەن كە دنیایە!! .. چیت دەربارەی ماڵێك بۆ باس بكەم كەسەرەتاكەی ماندوو بوون و سەغڵەتی و ناڕەحەتییە، كۆتاییەكەشی نـەمان و لـەناوچـوونە... لـەسـەر حـەڵاڵی دەپرسـرێتەوەو لـەسـەر حەرامیشـی سـزا دەدرێـت... ئـەوەی تیایـدا دەوڵەمەندە شەیداو لـەڕێگای ڕاست لادەرە، ئەوەش كەهەژارو نەدارە تیایدا دڵ تەنگ و خەمبارە...

* هەر لـەسەر ئەم باسە لـەوەڵامی یـەكێكی تـردا دەفـەرموێت: هـاوار بەماڵمان چیمان بەخۆمان كردووە؟ !! .. بەڕاستی دینـی خۆمـان لاوازكـردوەو دنیای خۆمان قەڵەو كردووە.. خووڕەوشتی خۆمان شڕو ئەبڵە كردووەو جێگەو بەرگی خۆمان تازەكردوەتەوە.

هەریەکەو لەسەر لاپاڵی لێداوەتەوەو لەماڵێك دەخوات کەماڵی خۆی نییە.. خواردنەکەی ناچارییەو بەزۆر دەسێندرێت.. خزمەتکردنیشی بێگارو زۆرەملێییە.. لەدوای ترش داوای شیرینی دەکات.. لەدوای سارد داوای گەرم دەکات.. لەدوای وشکیش داوای تەڕ دەکات..تا لەئەنجامی ئەم هەموو خواردنە قرپ و بۆنی ناخۆشی تێری زۆر خۆری لێدێت، ئینجا فەرمووی: ئەی غوڵام دەی هەرسکارێك بێنە با ئەو هەموو خواردنە هەرس بکات.. ئەی نەفام"وەڵڵاهی" هیچ شتێك هەرسی ناکات جگە لەدینەکەت.. دەزانی کوا دراوسێی موحتاجت؟! کوا هەتیوو بێباوکی برسی قەومەکەت؟!. کوا ئەو هەژارەی چاوی لەتۆیە؟!. ئەی دەزانیت لەکوێن ئەو ئامۆژگارییانەی خوای"عز وجل" پێی فەرموویت؟! خۆزگە دەتزانی تۆ پێکهاتویت لەچەند ژمارەیەك!! هەر ڕۆژێك خۆر بەسەرتدا ئاوادەبێت شتێك لە ژمارەکەت کەم دەکات بەشێك لەتۆ لەگەڵ خۆیدا دەبات. جارێك پێیانوت کە"فلان" غەیبەتی کردوویت.. ئەویش پارچە حەلوایەکی بۆ بردو پێی وت: پێم گەیشتوەتەوە کەتۆ چەند چاکەیەکی خۆتت بەدیاری بۆ من ناردووە، منیش ئەمەم لەپاداشتی ئەم چاکەیەتدا بۆ هێنایت.

* ڕۆژێك چەند (عەبد–کۆیلە) یەك دەچنە خزمەتی و داوای لێدەکەن لە وتاری هەینیدا باسی ئازادکردنی کۆیلە بکات، بەڵکو ڕزگاریان بێت، چاوەڕێ بوون لە هەفتەی یەکەم و دووەم و سێیەم هیچ باسی نەکرد تا لە هەفتەی چوارەمدا لە وتارەکەیدا باسیکردو هانیدان بۆ ئازادکردنی کۆیلەکان و پلەو پایەی قیامەتی بۆ ڕوونکردنەوە،بەهۆی وتارەکەی زۆر لەکۆیلەکان ئازادکران، بەخۆشییەوە هاتنە لای و سوپاسیان کرد بۆ ئەو وتارە هەست بزوێنە

کاریگەرەو ئینجا لێیان پرسی: بۆچی وتارەکەی ئەوەندە دواخست بۆ چوار هەفتە؟ ئەویش فەرمووی: لەڕاستیدا لەو کاتەدا خۆم کۆیلەم نەبوو تا ئازادی بکەم و پارەشم و نەبوو، لەبەرئەوە ئەم سێ هەفتەیە چاوەڕێمکرد تاخوای گەورە پارەیەکی پێبەخشیم، کۆیلەیەکم کڕی و ئازادمکرد، ئینجا هاتم لە وتارەکەمدا باسی پاداشتی کۆیلە ئازادکردنم کرد بۆ موسڵمانان، خوای گەورە بەرەکەتی خستە وتارەکەم و بەهۆیەوە ئێوەش ئازادبوون.

بەڵێ شێخ حەسەنی بەصری ڕەحمەتی خوای لێ بێت، قسەو کردەوەی یەك بوو، هەرچاکەیەك بەکردار نەیبا بەگوفتاریش نەیدەگووت.

* پیاوێك پێی گووت: کۆمەڵێك هەن لەکۆڕو مەجلیسەکانی تۆ دادەنیشن بۆئەوەی هەڵەو کەموکورتیت لێبگرن، فەرمووی: هەر گوێشی مەدەرێ و بایەخی پێمەدە، بەڕاستی لەگەڵ نەفسمدا خەریك بوم تاوای لێبکەم حەزی لەبەهەشت بێت، توانیم وای لێبکەم.

وە هەوڵمداوە لەگەڵیدا تاحەزی لەڕزگاربوون بێت لە ئاگرو بەجۆرێك بێت دوور بکەوێتەوە لە سزاو ئاگر، توانیم وای لێبکەم، بەهەمان شێوە هەوڵمداوە نەفسم لەناو خەڵکیدا سەلامەت دەرچێت و خەڵك ڕازی بکەم، بەڵام ئەوەم بۆ نەکراوە، خەڵکی لەبەدیهێنەرو ڕۆزیدەریان ڕازینین، دەی چۆن لەدرووستکراوانی وەکو خۆیان ڕازی دەبن؟؟!

* هاتنە خزمەتی و وتیان ئایا دەبینیت کە دەردو نەخۆشی چەندە زۆر بووە؟ .. فەرمووی: لەو ماڵ و سامانەی توونە گرتووتانە بەخشن و واز لەگوناهو تاوان بهێنن، ئامۆژگاری نەزان و بێباوەڕان بکەن.

* عەمرو کوڕی مەیمون کوڕی مەهران دەگێڕێتەوەو دەڵێت:

کە چوین بۆ بەصرە باوکم گوتی: وەرە بابچین بۆ لای ئیمام حەسەنی بەصری، لەگەڵ باوکم چوومە دەرەوەو چووین بۆماڵی ئەو، کە چوینە ژوورەوە بۆ خزمەتی؛ باوکم پێی وت: ئەبو سەعید: ڕەقییەك دڵی داگرتووم بۆم بپاڵێوەو لێمی جیابکەوە.

ئیمامی حەسەن ئەم ئایاتانەی بۆ خوێندەوە:﴿ أَفَرَأَيْتَ إِن مَّتَّعْنَاهُمْ سِنِينَ* ثُمَّ جَاءَهُم مَّا كَانُوا يُوعَدُونَ* مَا أَغْنَى عَنْهُم مَّا كَانُوا يُمَتَّعُونَ﴾[1]

باوکم گریا: هەتا کەوتە سەر زەوی قاچی لەسەر زەوی دەکووتا وەکو مەڕی سەربڕاو.. ئیمام حەسەن گرتی و دایە پڕمەی گریان لەگەڵیدا دەگریا بەدەنگی بەرز، هەتا جاریەکە هات و وتی: بەڕاستی شێختان ماندوو کرد هەستن بڕۆن، ئێمەش هاتینە دەرو ڕۆیشتین، کەبەڕێگادا دەڕۆیشتین باوکم مستێکی لەسنگمداو وتی: کوڕم چەند ئایاتێکی لەسەرمان خوێند ئەگەر تێیان گەیشتبای قسەت لەبیر دەچوونەوەو لاڵ دەبوویت، یان پێیان بریندار دەبوویت.

پرسیاریان دەربارەی دووڕوویی لێکرد، فەرمووی: دووڕوویی بریتییە لە جیاوازی لەنهێنی و ئاشکرایدا، ئەوەی لەناو دەرووندایە و لەدەرەوە دەیلێت و دەری دەبڕێت، ئەوانەی لێی دەترسن تەنها بڕواداران، ئەوانەش کەلێی ئەمینن تەنها دووڕووەکانن.

---

[1]-الشعراء ٢٠٥-٢٠٧//واتە: باشە ئایا ئەگەر ساڵەها مۆڵەتیان بدەین ژیانی دنیا بەخۆشی ببەنە سەر، باوەڕ دەهێنن؟! پاشان لەگەر ئەو هەڕەشەو سزایەی کەلەوان کراوە هاتەدی و پێشهات، دەتوانن چی بکەن؟! ئەوسا ئەو ڕابواردنەی دنیایان هیچ فریایان ناکەوێت و بێ سورد دەبێت.

* جارێك بەلای كەسانێكدا ڕۆیشت بەجۆرێك پێدەكەنین ئەویش فەرمووی: خوای"عز وجل" مانگی ڕەمەزانی كردوەتە گۆڕەپانێك بۆ درووستكراوانی كەتێیدا پێشبڕكێ بكەن لەگوێڕایەڵی و بەندایەتیدا، ئەوانەی پێش دەكەون براوەو سەركەتوودەبن و ئەوانەش كەبێ باكن و دوادەكەون ماڵ وێرانن، سەیرەكەی ئەوەیە یاریزانی واهەیە بەبردنەوەی پێشكەوتوان پێدەكەنێت و بەدۆڕان و وێران بوونی بێباك و دواكەوتوانەكەیشی هەر پێدەكەنێت.

* قەتادە دەڵێت: زاناترینی كەس بەحەلاڵ و حەرام حەسەنی بەصرییە.

*هاوەڵێكی تر دەفەرموێت: ئەگەر حەسەن لەسەردەمی هاوەڵاندا پێگەیشتبا، ئەوان پێویستیان بە پرس و ڕای ئەو دەبوو.

* ئیمام حەسەن گێڕانەوەی هەیە لە(عەبدولڕەحمانی كوڕی سەمرە) و لەگەڵیدا غەزای كردووە لەهەرسێ شوێنی"كابول و ئەندوقان و زابلستان" بۆماوەی سێ ساڵ.

* لەسەردەمی ئەمارەتی موعاویەدا نوسەری ڕەبیعی كوڕی زیاد بووە لە خۆراسان.

* ئەبو داودی سیجستانی دەڵێت: حەسەن لەخۆراسان بوو هاوڕێی"قَطَری كوڕی فوجائەو موهەلّەبی كوڕی إبن و أبی صفره ..." بوو كە لە ئازاترینی ئازایەكان بوون ئەوانە.

* هیشام كوڕی حەسسان دەڵێت: حەسەن لەئازاترینی كەسانی سەردەمی خۆی بوو.

* حومەیـد وتـی: حەسـەن دوو جـار حـەجی کـردووە، حـەجێك لەسەرەتای تەمەنی و حەجێکیش لەدوا دوایی تەمەنیدا.

## لەشێوە جوانەکانی کەسایەتی حەسەن

ئیمـامی حەسـەن ڕۆژووەوان و خۆگربـوو، سەرڕاسـت و جێگیربـوو، بەردەوام لەمانگە حەرامەکان و هەموو دووشەمە و پێنج شەممەیەك بەڕۆژوو بوە. حەسەن هەروەك زانایان دەفەرموون: برسی بوو، زانا بوو، بـەرزوو بەشـکۆبوو، ئاینخوازو شارەزابوو، خواپەرستێکی دنیا نەویست بوو، زۆر زیرەك و زمان پاراو بوو، باوەڕ پێکراو بوو، جێگای متمانە بوو، خاوەن بـاوەڕو پـاك بـوو، شـۆخ و شەنگ و جوان بوو..

"ئەبو بەردە" دەڵێت: کەسم نەدیوە بەقەد حەسەن لـەهاوەڵانی پێغەمبـەر "دروودی خوای لەسەر بێت" بچێت.

"ئـەبو جەعفـەری بـاقر دەڵێـت: قسـەکانی لـە قسـەی پێغەمبـەران دەچوو"علیهم السلام"دوچوو.

"ئەیووبی سەختیانی"دەڵێت: حەسەن باڵابەرز بوو، جەستەی بەهێز بوو، ڕووخساری گەشاوە بوو، سیمای جـوان و بەشـکۆ بـوو، ئەوەنـدە بەسـام بـوو پیاوێـك لـە سـێ وەرزی حەجـدا لەمەجلیسـەکانی دا بـوو، پرسـیاری هـەبوو نەیدەتوانی لێ ی بپرسێ لەبەر ئەو هەموو سام و هەیبەتەی کە هەیبوو.

"عاصی ئەحوەل" دەفەرموێت: بە شەعبیم ووت: پێویسـتیەکت هەیـە؟ دەڕۆم بۆ بەصرە، وتی بەڵێ، ئەگەر گەیشتیە بەصـرە سـەلامی مـن بگەیەنـە بـە حەسەنی بەصری، پێم وت: نایناسم، وتی کەچویتە ناو بەصرە چـاو بگێـڕە کـێ جوانترین پیاو بوولەبەرچاوت، وەلەهەموو کەس زیاتر دەکەوتـە بـەردڵت ئـەوە

خۆیەتی، سەلامی منی پێبگەیەنە، ئەگەر کەسی وات نەبینی ئەوا لە مزگەوتە لەوێ دەیبینی، خەڵکێکی زۆر بەدەوریەوە دانیشتوون، ئینجا دەچی بۆلای و سەلامی منی پێدەگەیەنیت.

"قەتادە"ئەفەرموێت: حەسەنی بەصری ئەوەندە بەسام و بەرێز و شکۆ بوو، زانایان لەپێش هەموو کەسێکدا شەرمیان لێ ئەکرد.

"ئەشعەث"ئەفەرموێت: بەکەس نەگەیشتووم دوای حەسەن ئیللا لەو بچوکتر[1] هاتۆتە بەرچاوم.

"بەکری کوڕی عەبدوڵای مەزنی"ئەفەرموێت: کێ ئەیەوێت بڕوانێتە زاناترین و شەرعزانترین کەس ئەوا با بڕوانێتە حەسەنی بەصری.

"حەکیمی کوڕی جەعفەر" ئەڵێت: بڵێن بزانن کێ حەسەنی دیوە؟ بەڕاستی ئەگەر حەسەنت دیتبا ئەتگووت خەمی هەرچی درووستکراوانی خوا هەیە لەسەریەتی لەزۆری ئەوهەموو هەنسك و فرمێسکانەی.

ئیمام"حەسەنی بەصری" مافی برایەتی زۆربەجوانی ئەزانی، ئەوەتا "قەتادە" ئەڵێت: چووین بۆ ماڵی ئیمام حەسەن کاتێك چووینە ژوورەوە خەوتبوو، لەلای سەریەوە سەبەتەیەك دانرابوو، هێنامان و سەیرمانکرد، هەندێك نان و میوەی تێدابوو، ئێمەش خواردمان، کاتێك خەبەری بووەوە زانی چیمان کردووە، زەردەخەنەیەکی کردوو ئەوەی خوێندەوە "أوصدیقکم لیس علیکم جناح".

"جریری حازم" ئەڵێت: لای حەسەن بووین تانیوەڕۆ هات، کاتی نانخواردن، کوڕەکەی ووتی بەڕاستی ئێوە بوونە زەحمەت لەسەری، ئەوەتا ئەو نە نانی بۆ ئەخورێت، نە ئاوێك ئەخواتەوە، ئیمامی حەسەن فەرمووی: لێیان گەڕێ

[1] / مەبەستی تەقوا زانستە نەك تەمەن.

وەڵاهی هیچ شتێك بەقەد بینینی ئەوان چاوم ڕوون ناکاتەوە، ئەگەر موسـڵمانێك سەردانی براکەی بکات، با قسە بکـەن و یـادی خـوا بکـەن و سوپاسـگوزاری پەروەردگاریانبن تاتوانای قسەیان هەبێت.

جارێك ئیمامی حەسـەن گەیشـت بەهەنـدێك لـەبراکانی، دواتـر کـە ویستی لێیان جیابێتەوە، عەمامەکەی لەسەری خۆی لابـردوو لەبـەر یـەکێکیانی کردوو ووتی: بیفرۆشەو سوود لەپارەکەی وەربگرە.

جەریری کوڕی حازم لە حومەیدی کوڕی هیلال دەگێڕێتەوە: کە ئـەبو قەتادەی عەدەوی پێی ووتین: بابەندی ئەو شێخەبن. حەسەنی بەصـری بەڕاسـتی نەمدیوە کەسێك بەقەد ئەو لە "عومەری کوڕی خطاب" بچێت.

ئەصمەعی لەباوکیەوە بۆمان دەگێڕێتـەوە: نەمـدیوە بـازوو لـەبازووی حەسەن پانتر، پانی باسـکی بستێك دەبوو.

أمـة الحکـم دەڵێـت: هـەرگیز لاوێکـم نـەبینیوە ڕواڵـەتی لـە حەسـەن جوانتربێت.

ڕەوحی کوڕی عوبادە ئەڵێت: حەجاج لئەسوەر وتـی: پیاوێـك ئـاواتی دەخواست و ئەیووت: خۆزگـە بـە زوهـدی حەسـەن و وەزعـی إبـن سـیرین و عیبادەتی عامری کوڕی عبد قیس و شـەرعزانیی سـەعیدی کـوڕی موسـەیەب، موطەریف ئەڵێت: بڕوانن ئەمانە هەرهەمووی لەحەسەندا هەیە.

بەڕاستی حەسەنی بەصـری توانایـەکی زۆری زیرەکـی و هوشـیاری و هەستیاری و دینی هەبوو، ئەو ڕێنمـایی ئـەوەی دەکـرد کـە دوورویـی ئێسـتاش بەردەوام دەژی لەکۆمەڵگـەی ئیسـلامیدا و زاڵـە بەسـەر ژیـانی ڕامیاریـدا، وە لەشارە گەورەکان و پایتەختەکانی ئیسلامدا.

لەبۆنەیەکدا وتی:" پاك و بێگەردی بۆ خوا، ئەو ئوممەتە ناگاتە شتێك بەقەد دووڕوویی کاریگەری لەسەری هەبێت و جێگای خەفەت بێت بۆی ..." ئاماژەی بە کاربەدەست و فەرمانڕەواکان دەکرد.

جارێکی تر فەرمووی: " ئەگەر بچنە دەرەوە دەبینیت نیوەتان دوژمنتانن .." مەبەستی سوپای ئیسلامی و سەرکردەکان بوون.

لەگەورەترینی هۆکارەکانی کارتێکردن و جولانی هەستی کۆمەڵگەو کاریگەری لەدڵ و ژیریاندا ئەوەبوو: لەژێ هەستیارەکانی دەداو دادەبەزییە ناو قولایی کۆمەڵگەو نەخۆشییەکانی دیاری دەکردن، ڕەخنەی لێدەگرتن و بەرهەڵستی دەکرد، ڕەخنەو بەرهەڵستیەکی حەکیمانەی نەرمونیانانە وەك ئامۆژگارێکی پەرۆش، سەردەمی ئەو پڕبوو لەبانگخوازو ئامۆژکار، بەلام کۆمەڵگە ئەوەندەی گوێڕایەڵی ئەوبوون، هی کەسیتر نەبوون، چونکە بەدڵ بۆیان پەرۆش بوو، وە دەچووە ناو کرۆکی ژیانیان، دژایەتی تەوژمەکانی دەکردو هەواڵی مردنی دەداو بەئاگای دەهێنانەوە لەخۆخەریك کردن و تەرخان بوونیان بەهەواو ئارەزووەکانیان، دوارۆژی دەهێنایە بەردەمیان، بەردەوام لەململانێدابوو لەگەڵ نەفامی و نەزانیدا.

## حەسەن و کاربەدەستان

کارو ڕاسپاردەکانی حەسەنی بەصری لەوڵاتدا بڵاوبوونەوەو ناوبانگ و بیرخستنەوەکانی دەماو دەم لەناو بەندەکاندا دەگێڕدرانەوەو باسیان لێوە دەکرا، خەلیفەو میرنشینەکان پرسیاریان لەبارەوە دەکردو هەواڵیان دەپرسی و شوێنی دەکەوتن.

خالیدی کوڕی صەفوان بۆمان دەگێڕێتەوەو دەڵێت: گەیشتم بە "مەسلەمەی کوڕی عەبدولمەلیك[1]" لە "حیرە"، پێی ووتم: خالید هەواڵم بدەیە لەسەر حەسەنی بەصرە، من وا تێدەگەم و گومان دەبەم تۆ ئەوەندە کارو فەرمانی ئەو دەناسیت، کەس وەکو تۆ نایناسێت، ووتم: خوا چاکە بۆ ئەمیر بکات، من لەهەموو ئەوانە باشترم کەزانیاریت دەربارەی ئەو بدەمێ، من لەماڵەوە دراوسێی ئەوم، بەردەوام لەکۆڕو مەجلیسەکانیدا دادەنیشم، خەڵکی بەصرە بەهۆی ئەوەوە دەناسم، ووتی: چیت هەیە بیڵێ، ووتم: ئەو کەسێکە نهێنی و ئاشکرای وەکو یەکە، گوفتارو کرداری یەکە، کە فرمان بەچاکە دەکات هەموو کەس کاری پێدەکەن، کە نەهی لەخراپەیەك دەکات هەموو کەس تەرکی ئەو خراپەیە دەکەن، کاتێك دەیبینم لەخەڵکی دەوڵەمەندترە بەڵام لەناویاندا دەروێش و بچووك دادەنیشێت، وەخەڵکیش دەبینم زۆر پێویستیان پێیەتی و داوای ئەوەی لێدەکەن کەهەیەتی.

مەسلەمە وتی: بەسە، ئەی خالید بەس !! چۆن خەڵکێك داماوو سەرشۆڕ دەبێت کاتێك لەوجۆرە کەسە لەناویاندا هەبێت.

---

[1]- مەسلەمە: گەورەو سەرکردەی پاڵەوانانی بەنی ئومەییە بوو لەڕزگارکردنی "قسطنطینیه"و مزگەوتی"مەسلەمە"شی تیا دروستکرد.

دوای وەفاتی خەلیفەی خواناس"عومەری کوڕی عبدالعزیز" و گەڕانەوەی بۆلای خوای خۆی، خەلافەت درایە دەستی"یەزیدی کوڕی عبدالملیك"، ئەویش "عومەری کوڕی هوبەیرەی فەزاری" کرد بە والی بەسەر عێراقەوەو خۆراسانیشی خستە سەر، "یەزید" ڕەفتارێکی دەنواند بەرامبەر خەڵکی جیابوو لەڕەفتاری پێشینە باشەکانی خۆی، نوسراو بەدوای نوسراوی دا دەنارد بۆ "عومەری کوڕی هوبەیرە"و فەرمانی پێدەکرد ئەوەی تیایاندا هاتووە جێبەجێی بکات، لەکاتێکدا زۆرینەی ئەو نوسراوانە مافی خەڵك و ڕاستی تێدا نەبوو و نەدەپارێزرا، "عومەری کوڕی هوبەیرە"ناردی بەدوای هەریەك لە"حەسەنی بەصری"و"عامری کوڕی شەراحیل" کەناسرابوو بە-شەعبی- کەئەمە لەساڵی "١٠٣"ی کۆچیدا بوو، ئەوانیش هاتن تابزانن والی بۆچی ناردویەتی بەدوایاندا؟ ئینجا"عومەری کوڕی هوبەیرە" پێی ووتن: ئێوە دەزانن ئەمیری ئیمانداران"یەزیدی کوڕ عبدالملیك" جێنشینی خوایە لەسەر بەندەکانی و گوێرایەڵی کردنی لەسەر خەڵکی واجبە، وەك دەبینن منی کردووە بەوالی لەکارو باری عێراق و دواتر کردومی بەوالی بەسەر فارسیشەوە، وە ئەو زۆرجار نوسراوم بۆ دەنێرێت و فەرمانم پێدەدات کە جێبەجێی بکەم کەهیچ دڵنیانیم لەدادپەروەرییەکەی، ئایا بەڕای ئێوە ئەگەر شوێنی بکەوم و فەرمانەکانی جێبەجێ بکەم ئایا سەرپێچی یە لەبەرنامەی خواو لەڕێگای ڕاست لامداوە؟

"شەعبی"لەوەڵامەکەیدا نەرم و نیانی بۆخەلیفەو ئاسانکاری بۆ والی تێدا نواند، .. حەسەن بێدەنگ بوو ..

"عومەری کوڕی هوبەیرە"ڕووی کردە حەسەن و ووتی: تۆ دەڵێیت چی ئەبو سەعید؟ حەسەن کەوتە قسە، وەك شێر نەڕاندی، وەك تیر لەکەوان دەرچوو، وەك شیر لەکێلان هاتەدەرەوە، فەرمووی: ئەی"کوڕی هوبەیرە"ترسی

خـوات هـەبێت لەیەزیـد، ترسـی یـەزدت نـەبێ لـە خـوا.. بزانـە کـەخوای "عزوجل"دەتپارێزێت لە یەزید، بەڵام یـەزد ناتپارێزێـت لـەخوا... ئـەی"کـوڕی هوبەیرە" زۆر نزیکە خوای گەورە فریشتەیەکی بەزەبرو تەندو تیژت بۆ بنێرێـت، کەلە فەرمانی خوا دەرناچێت، وەدات دەبەزێنێت لەسـەر تـەختی خەوەکـەت و لەو کۆشك و تەلارە فراوانەوە دەتگوازێتەوە بۆ گۆڕە تـەنگ و تاریکەکـەت... لەکاتێکدا یەزید لەوێ نییـە هاوڕێیـەتیت بکـات بـەڵکو کردەوەکانـت لـەوێ هاوڕێتن کەبێ فەرمانی پەروەردگاری "یەزید"ت پـێ کـردوون.. ئـەی (کـوڕی هوبەیرە) ئەگەر تۆ لـەگەڵ خوادابیت وەگوێڕایەڵی فەرمانی خوابیـت ئـەوا خـوا دەتپارێزێت لەئازارو زیانی "یەزیدی کوڕی عبدالمليك" لـەدنیاو ڕۆژی دوایـدا، وەئەگەر لەگەڵ"یەزید"بیت لە سەرپێچی فەرمانی خوای باڵادەست ئـەوا خـوای گەورە بەجێتدەهێڵێت بۆ یەزید، .. وە بزانە ئەی "کـوڕی هوبـەیرە" گوێڕایـەڵی بۆفـەرمانی هـیچ دروسـتکراوێکی خـوا ناکرێـت لەسەرپێچـی کردنـی خـوای بەدیهێنەر، جا ئەو دروستکراوی خوایە هەرکەس بێت و لەهـەر شـوێنێك بێـت، "عومەری کوڕی هوبەیدە" زۆرگریا بەجۆرێك بـە فرمێسـکەکانی ڕیشـی جـوان تەڕبوو... ئەم وەڵامەی حەسەن بەجۆرێك کاری کردەسەر "شەعبی"وای لێ کرد زیاد لەپێویست ڕێزو شکۆو خۆشەویستی بۆ حەسەن بنوێنێت... ئینجا بەیەکەوە هاتنە دەرەوەو عومەریان بەجێهێشت و بـەرەو مزگـەوت ڕۆشـتن خـەڵك لێیـان کۆبوونەوەو پرسیاریان دەکرد لەهەواڵی هەردووکیان لەگـەڵ ئـەمیری هـەردوو عێراق[1]،"شەعبی" ڕوی تێکردن و ووتی: سوێند بەوکەسەی گیانی منی بەدەسـتە ئەوەی حەسەن بە"عومەری کوڕی هوبەیرە"ی ووت من لێی بێئاگا بـووم، بـەڵام ئەوەم ویست کەئەو لـەڕووی کـوڕی"هوبـەیرە"دا ووتـی وە ئەوەشـم دەوێـت

[1]-مەبەست کوفەو بەصرەیە.

لەبەرامبەر خوا کە ئەو ووتی، خوای گەورە منی لەکوڕی "هوبەیرە" دوورخستەوەو ئەویشی لیّ نزیك خستەوە و خۆشەویستی کرد لەلای...

حەسەن"خوای لیّ ڕازی بیّت" وازی لەدنیا هیّنابوو، بەتەواوی بیّبایەخ بوو لەلای، هەموو شتەکان لەبەرچاوی ئاسان بوون، ئەوەندە گوێی نەدەدا بەکاربەدەستی ستەمکار، یان سەرکردەی نەزان، یان خاوەن دەسەلاّتی خۆبەزلزان، بەلاّم لەبەر خاتری خوا خەلّکی لەستەم و خۆبەزلزانییەکەیان ئاگادارده‌کردەوەو بۆی باس دەکردن.

کاتیّك حەجاجی کوڕی یوسفی سەقەفی بوو بە والی عیّراق، بەهۆی ئەو بوونە والیەتیەوە سەرکەش و لەخۆباییی بووبوو، ستەمی دەکرد، ئیمام حەسەن یەکیّك بوو لەو پیاوانەی قسەیان لەسەردەکردو ستەم و سەرکەشیەکەیان دەخستە ڕوو، لەناو خەلّکدا باسی زۆرداری و کارو کردەوە خراپەکانیان دەکردو قسەی ڕاستیان لەڕوودا دەووت.

حەجاج کۆشکیّکی نایابی بۆخۆی لە"واسط"[٢] درووستکرد، کاتی بیّ ئیشی خەلّکی بانگ دەکرد تا بیّنە دەرەوە بۆ سەیرکردنی و داوای نزاو دۆعای بەرەکەتی لیّ دەکردن، شیّخ حەسەن نەیدەویست ئەو هەلەی لەدەست بچیّت، کە خەلّك بەم شیّوەیە تیّیدا کۆدەبوونەوە، لەبەرئەوە لەگەلّیان دەچووە دەرێ بۆ ئامۆژگاری و یادخستنەوەو ووریاکردنەوەیان لەحەقیقەتی دنیا، تاپیّیان بلّیّت کە دنیا ئەوەندە ناهیّنیّت بەم شیّوەیە خۆیانی پیّوە هیلاك و ماندووبکەن، سەرنجیان ڕاکیّشیّت بەلای پاداشتی بەرزو نەبڕاوەی خوای"عزوجل" کەدەستیان دەکەویّت، بەم شیّوەیە ئەویش لەگەلّ خەلّکەکە دەچوو، کەدەگەیشتە ئەو شویّنەی ئەو بیناکەی لیّ درووست کردبوو.

---

[٢]-واسط: شاریّکە دەکەویّتە نیّوان بەصرەو کوفە.

بەڵێ، ئەو کۆشکە تەلارێکی بەرزو بڵندبوو بەجوانترین شێوە بنیات نرابوو، خەڵکی بەدەوریدا دەسورانەوە، بەجۆرێك بوو سەر سوڕدەما لەفراوانی ناوچەو چواردەورو لادیوارەکانی، واق و وورِدەبوو لەوەستا کاری و بەسەلیقەیی لەدرووستکاری و نەخشاندنی زەخرەفەکانی.

لەو شوێنەدا شێخ حەسەنی بەصری لەناو خەڵکەکەدا دەوەستاو ووتاری دەدا، بۆ یادخستنەوەی خەڵك و ئامۆژگاری کردنی حەجاج بەقیامەت، هەندێك لەو ووشەگەلەی دەیفەرموون: (( ئێمە کۆتایی خراپترینی خراپەکارانمان بیستووەو بینیوەو لەناویاندا "فیرعەون" کەچەند تونـدو تیـژی نوانـدو لەوە زیاتربوو کە حەجاج دەینوێنێ، وەبینای لەوە بەرزتری درووست کردبوو، پاشانیش خوای گەورە بەهیلاکی بردوو ئەوەش کە دروستی کردبوو لێی تێکدا، خۆزگە حەجاج ئەوەی دەزانی کە ئەهلی ئاسمان نیعمەت و خۆشگوزەرانی پێداو تێری کردوو ئەهلی سەرزەویش دەستخەڕۆیان کردوو فریویاندا،...)).

ماوەیەك بەسەرئەم حاڵەت و شێوازەدا تێپەڕی، هەتا یەکێك لە ئامادەبووان و گوێگرانی کەبەخەمیەوەبوو دڵی بۆی سووتاو ترسا لەوەی حەجاج تۆڵەی لێ بسێنێت، یان بەڵایەکی بەسەر بێنێت، بۆیە پێی ووت: بەسیکە ئەی ئەبو سەعید بەسە.

حەسەن پێی ووت: خوای گەورە بەڵێنی لەئەهلی عیلم وەرگرتووە کەدەبێت شتەکان بۆ خەڵکی ڕوون بکەنەوەو نەیشارنەوە.

ڕۆژی دواتر حەجاج هاتە ناو کۆڕەکەیەوەو لەتوڕەیدا پیشی دەخواردەوە، بەدانیشتووەکانی ووت: وێرانبن، دەستتان بشکێت، لەناوچن...، بەندەیەك لەبەندەکانی خەڵکی بەصرە قسە بەئێمە دەڵێت و ئینجا لەناو ئێوەشدا

کەسێك نییە بەرپەرچی بداتەوە، وەڵڵاهی لەخوێنی ئەو پاراوتان دەکەم ئەی ترسنۆکینە.

پاشان فەرمانی دا شیرو"نەطع"[1] ئامادەکرا، بانگی جەللادی کردو لەبەردەستی ڕاوەستا، فەرمانی کرد حەسەن بێنن، تەنها بەماوەیەکی کەم حەسەن هات، سەیری کرد"حەجاج" چاوی زەق بووەو لەتوڕەیدا پیش دەخواتەوە، ئینجا "شیرو نەطع وجەللادی" بینی، لێوەکانی جولاندو لەبەر خۆیەوە شتێکی ووت، پاشان ڕووی کردە"حەجاج" بەجۆرێك کەمەزنایەتی بڕوادارانەو چەسپاوی و هێزی موسڵمانانەو ویقارو شکۆداریەتی بانگخوازانەی بۆلای خوا لەڕوودا دەدرەوشایەوە.

کاتێك"حەجاج" حەسەنی لەسەر ئەم شێوەیە بینی کە سام و هەیبەتێکی زۆری هەبوو، بەجۆرێك سڵی لێدەکردەوە، زۆر ترسا ئینجا بەرێزەوە پێی ووت: ئالێرەوە ئەی ئەبو سەعید، ئا ئێرە، بەگەورەیی لێی دەڕوانی و جێگەی بۆ دەکردەوەو بەردەوام دەیووت ئا ئێرە .. خەڵکیش بەواق وڕماوی و حەپەساویەوە سەیری ئەو دیمەنەیان دەکرد، هەتا"حەجاج" ئەبو سەعیدی بردە سەر جێگای دانیشتنی خۆی و لەوێ دایینیشاند، کاتێك حەسەن جێگەی دانیشتنی خۆی وەرگرت، "حەجاج" ڕووی تێکردو چەند پرسیارێکی دەربارەی هەندێك کاروباری ئاینی لێکرد، حەسەنیش وەڵامی هەموو پرسیارەکانی دایەوە بەزانستێکی فراوان و ڕوونکردنەوەی تەواو بەنەرم و نیانی و چەسپاوی و دامەزراوییەوە.

[1] - نەطع :ئەو پێستەیەیە کەلەژێر تاوانباردا دادەنرێت لەکاتی سەر بڕینیدا.

حەجاج پێی وت: بەڕاستی تۆ گەورەی زانایانیت ئەی ئەبو سەعید، پاشان زۆر بەگران و سەنگینی دوعا خوازی لێکرد و ڕیشی بۆنخۆش کردو بەڕێی کرد.

کەحەسەن ڕۆیشت پاسەوانی "حەجاج" لەگەڵیدا ڕۆیشت تا بەڕێی بکات، کەچوونە دەرەوە پرسیاری لێکرد: ئەبو سەعید،"حەجاج" بۆ غەیری ئەوە بانگی کردبووی کە لەگەڵتدا کردی، من تۆم بینی کەبەرەو ڕووی "حەجاج" چویت و"شیرو نەطع و جەلادەکەت" بینی، لێوەکانت جوڵاند ئەوە چیت وت؟ ئیمامی حەسەن فەرمووی: ئەو دوعایەم خوێند:"یاولي نعمتي و ملاذي عند كربتي، اجعل نقمته بردا وسلاما عليّ كما جعلت النار بردا وسلاما على إبراهيم"[1].

بەڕاستی ئیمامی حەسەن زۆری لەو هەڵوێستانە هەن بەرامبەر سەرکردەو ئەمیرەکان، وە لەلای هەموویان بەگەورەیی و شکۆمەندییەوە سەرکەوتووەو لەبەرچاوی سوڵتانەکان بەرێزبووە، بەپشتیوانی و پارێزگاری خواوە پارێزراو بووە.

* کە عومەری کوڕی عبدالعزیز"ڕەحمەتی خوای لێ بێت" بوو بەخەلیفەی موسڵمانان،نامەیەکی بۆ حەسەنی بەصری نووسی تیایدا داوای لێکردبوو کە چەند خەسڵەت و ڕەوشتی پێشەواو دادپەروەری بۆ بنوسێت، ئەویش لە وەڵامی نامەکەدا بۆی نووسی:

● بزانە ئەی ئەمیری ئیمانداران

---

[1] -واتە: " ئەی بەخشندەو پشتیوان و هاوکاری بەهرەو بەخششەکانم، ئەی پەناگەم لەکاتی ناڕەحەتی و خەفەت و نەهامەتیەکانم، ئەو تۆڵەو تووڕەییەی ئەوم لەسەر ساردو سەلامەت کەوە چۆن ئاگرەکەت لەسەر"إبراهيم-عليه السلام-"ساردو سەلامەت کردەوە.

خوای گەورە پێشەوای دادپەروەی کردووە بەڕاست کەرەوەی هەموو چەوتی یەك و تێکشکێنەری هەموو ستەم کارێك و چاکسازی هەموو خراپە کارێك و هێزو دەسەڵاتە بۆ هەموو لاوازو بێدەسەڵاتێك و وەرگرەوەی مافی هەموو ستەم لێکراوێك و پەنایە بۆهەموو دڵ شکاو و پەژارەدارو هەموو زۆرلێکراوێك.

●ئەی ئەمیری ئیمانداران

–پێشەوای دادپەروەر: وێنەی شوانێکی دڵنەرم و میهرەبانە بۆ ووشترەکەی، لەگەڵیدا نەرم و نیانە، دەگەڕێت بەدوای خۆشترین لەوەڕگادا بۆی ئامادە بکات، دووری دەخاتەوە لە لەوەڕگا مەترسی دارەکان تانەفەوتێت، دەیپارێزێت لە ئاژەڵی دڕندە، پەنای بۆدروست دەکات تالە ئازاری سەرماو گەرما بەدووربێت و بیپارێزێت.

–پێشەوای دادپەروەر: وەکو باوکێکی بەپەرۆش و هەڵ بەکارهێنە بۆ منداڵەکانی، تابچوکن بۆیان تێدەکۆشێت و ماندوو دەبێت، کە گەورەش بوون فێریان دەکات، لەهەموو ژیانیدا هەوڵ دەدات و بژێوییان بۆ پەیدادەکات و بۆشیان پەسەندە دەکات تابۆیان بەجێ بهێڵێت.

–پێشەوای دادپەروەر: وەکو دایکێکی میهرەبان و چاکەخوازو بەسۆزە بۆ منداڵەکەی، لەناو سکدا هەڵی دەگرێت بەسەغڵەتی و بەناچاری، منداڵەکەی دەبێت هەر بەسەغڵەتی و بەئازارەوە، بەمنداڵی پەروەردەی دەکات، شەوانە تامنداڵەکەی نەخەوێت بۆخۆی ناخەوێت و شەونخونی دەکات بەدیارییەوە، ئەگەر ئەو ئارام بێت دایکەکەش ئارامە، ماوەیەك شیری پێدەدات، دواتر لەشیری دەبڕێتەوە، دڵ خۆشە بە خۆشی و لەش ساغی ئەو، وەدڵ تەنگ و خەمبارە بەناخۆشی و ناتەندروستی و ناڕەحەتیەکانیەوە.

●ئەی ئەمیری ئیمانداران،

-پێشەوای دادپەروەر: پەنایە بۆ بێباوکان، پەسەندەکارو گەنجینەوانە بۆ هەژاران، بچوکیان پەروەردەدەکات و بۆگەورەشیان ئازووخە دەخات و پێیان دەبەخشێت.

-پێشەوای دادپەروەر: وەکو دڵ وایە بۆجەستەو ئەندامەکانی بەچاکی ئەو هەموو چاك دەبن و بەخراپیشی هەموو خراپ دەبن.

-پێشەوای دادپەروەر: وەستاوە لەنێوان خواو بەندەکانیدا، گوێرایەڵی فەرمانی خوا دەکات و گوێ بۆبەندەکانیشی دەگرێت و سەرۆکایەتیان دەکات.

ئەی ئەمیری ئیمانداران،

کاتێك خوا دەسەڵاتی پێداویت نەکەی وەکو بەندەیەك بی کەئاغاکەی لێ ی دڵنیایەو باوەڕی پێیەتی و دەیکاتە پارێزەری ماڵ و منداڵ و سامانی، بەڵام ئەو سامانەکەی لێ پەرش و بڵاودەکات و بەفیڕۆی دەدات، وەماڵ و منداڵیشی ئاوارەو دەربەدەر دەکات.

منداڵ و خێزانی هەژار دەکەون ماڵ و سامانیشی لەدەست دەدات.

● وەبزانە ئەی ئەمیری ئیمانداران:

خوای گەورە سنووری گەورە کردووە وەکو بەربەستێك بۆ قەدەغەی کاری ناڕەواو خراپەکاری، ئەی ئەگەرهات کێ لای دەبات، وەخوای گەورە تۆڵە سەندی دیاری کردووە لەپێناو ژیانی بەندەکانیدا، باشە ئەگەر بۆخۆی بیانکوژێت کێ تۆڵەیان دەستێنێت!.

● لەبیرت بێت، ئەی ئەمیری ئیمانداران:

تۆماڵێکی ترت هەیە جگە لەوماڵەی ئێستا تیایدا دەژیت، کەدەبێتە جێگەو هەوارت بۆژیانێکی دووروو درێژ، وەلە خۆشەویستەکانت جیادەکاتەوەو

دەتخەنــە قــولایی ئەومالــەوە بــەتاقی تــەنیاو بێهــاودەم، دەی توێشــووی چــاکی بۆئامادەبکە تاهاوڕێیەتیت بکات لەو ڕۆژەدا کەکەس فریـات ناکـەوێت و مـرۆڤ ڕادەکات لەبراو دایك و باوك و هاوڕێ و هاوسەرو منداڵەکانی.

● لەبیرت بێت، ئەی ئەمیری ئیمانداران:

کاتێك گۆڕەکان یەکالا بوونەوەو زیندوو کرانـەوەو لـەگۆڕ هاتنـەدەر وەهەرچیەکیش لەسینەکاندا هەیە هەرهەموو ئاشـکراکران و خرانـە بەردەسـت، نهێنیەکان دەردەکەون و ئەو نامەو دۆسیەی هـەموو کاروکردەوەیـەکیان تۆمـار کردووە هیچ گوناهێکی ووردو درشـتیان بـەجێ نەهێشـتووە، هـەمووی تۆمـار کراوە.

● ئێستا، ئەی ئەمیری ئیمانداران:

تۆ لەشێنەیی دای، دەی پێش ئەوەی مردن یەخەت بگرێت و هەموو هیواو ئومێدێکت لێببڕێت، فەرمانڕەوایی بەندەکانی خـوا مەکـە هـەروەکو فـەرمانڕەوا نەزان و خۆویستەکان.

ئـەی ئـەمیری ئیمانـداران، بەنـدەکانی خـوا مەخـەرە سـەر سـتەم کـارو زۆرداران، وەخۆبـەزل زانـەکان زاڵ مەکـە بەسـەر لاوازەکانـدا، ئـەوان پـەیمان ناپارێزن و چاودێرو ئاگاداری بەڵێنەکانیان نین لەگەڵ ئیمانداراندا.

باری خۆت هەڵدەگریت و باری خەڵکی تـریش لەگەڵیـدا، وەقورسـایی خۆت هەڵدەگریت و قورسایی خەڵکی تریش، خەڵکێك بـێ ئاگـات نـەکات و بەهۆی داماوی و لاوازی تۆوە خۆشگوزەران بن و لەخۆشیەکانی دنیادا بخۆن و بەو هۆیەشەوە تۆ خۆشیەکانی قیامەتت لەدەست بچێت.

سەیری تواناودەسەڵاتی ئـەمڕۆت مەکـە، سـەیری توانـاو دەسـەڵاتی سبەینێت بکە کەدەکەویتە داوی مەرگەوە، لەنێوان دەستی خوادا دەوەستێنرێیت

لەناو کۆمەڵی فریشتەکان و پێغەمبەران"علـیهم السـلام"و نێردراوانـی خـوادا، هەرچی ڕوخسارەکانە لەو ڕۆژەدا -کە قیامەتە- مل کـەچ و فـەرمان بـەردارن بۆئەو زاتەی کەهەمیشە زیندووەو دەسەڵاتی بێسنوری هەیە.

هەرچەندە من بە ئامۆژگاریەکانم نەگەیشتوومەتە ئەو ئاستەی خـاوەن عەقڵەکان لەپێش مندا پێی گەیشتوون، دەی تۆش سستی و کەم تەرخەمی مەکـە لەشـەفەقەت و ئامۆژگـاری دا، ئـەم نوسـینەم دەنێـرم بۆتـۆ وەك چارەسـەری خۆشەویسـتێك کاتێـك چـۆن دەرمـانێکی تـاڵی پێدەخواتـەوە بەئومێـدی چـاك بوونەوەو تەندروستی و لەشی ساغ.

والسلام عليكم ورحمة الله وبركاتة

ئەی ئەمیری ئیمانداران

* جارێکی ترو لەنوسراوێکدا بۆ "عومەری کـوڕی عبـدالعزیز"نوسـیویەتی و دەفەرموێت:

• دنیا ماڵی ترسە، ئەوەتا سزای (حەزرەتی ئادەم)"علیە السـلام" ئـەوەبوو خوای گەورە لەبەهەشتەوە هێنایە سەر دنیا.

•بزانە کە کەوتن بەهۆی دنیاوە وەکو هیچ کەوتنێکی تـر نییـە، کەسـێك ڕێزی بۆدابنێت، ئەوا بەپێچەوانەوە دنیا ئەو سـوك دەکـات، لەهـەموو کاتێکـدا کوژراوی هەیە، تۆ ئەی ئەمیری ئیمانداران وەکـو تیمارکـاری برینـدارێك وابـە کـەئارام دەگرێـت لەسـەر ناخۆشـی و سـەغڵەتی دەرمانەکـە لەترسـی ئـازارو ناڕەحەتییەکی بەردەوام و درێژخایەن.

• بزانە کەبیرکردنەوە بەرەو کرداری خێرو چاکت دەبات، وەپەشیمانی لەشەڕ، وات لێدەکات تەرکی ئەو شەڕە بکەیت و وازی لێبهێنیت، دەوڵەمەندی دنیا ئەگەر زۆریش بێت هیچ نییە هەرچەندە لەلاشت خۆشەویست بێت.

• وریابە دنیا خانەی ململانێ و فریو دان و فێڵ و تەڵەکەیە، ڕازاوەیی و جوانییەکەی مرۆڤ لەخشتە دەبات و بێئاگای دەکات، ئەوانەی ئەهلی دنیایین بەهۆی هیواو ئارەزووەکانیان و پەرۆشیان بۆ دۆستایەتی و هاوڕێیەتی دنیا دەفەوتێنن و لەناودەچن، چونکە دنیا لەبەرچاویان وەکو بوکێکی بەعیشوەو ڕازاوەیە، چاوەکان بۆی دەڕوانن، نەفسەکان عاشقی دەبن، دڵەکان شەیدای دەبن، ژیرەکان بێهۆش دەکات، وەهەموو ئەوانەی دەیانەوێت پێی بگەن دەیانکوژێت، ئەوەی ماوە هیچ ڕێزو بایەخێك بۆڕابردوو دانانێت، ئەوەی لەدوایشدا دەبینێت هیچ دژایەتییەکی ناکات، وە ژیرەکانیشی بەوهەموو ئەزموون و تاقیکارییە سوودمەند نابن، بەڵێ، ئەوە سەرەنجامی ئەهلی دنیایە.

• خۆتی لێبپارێزە بەهەموو وریاییەوە، بەڕاستی دنیا وەکو مار وایە کەدەستی لێدەدەیت نەرم و شلە بەڵام ژەهرەکەی کوژەرە، ئەوەی لەدنیادا زۆر پێی سەرسامیت لێی دووربکەوە تا دۆستایەتیت لەگەڵیدا کەم بێت، هەمم و غەمەکانی لەسەر خۆت لابەرە تا لەبەڵاو کارەساتە دڵ تەزێنەکانی ئازار نەچێژیت.

• ڕازی بە بەوەی کە هەردەبێت ڕۆژێك لەڕۆژان بەجێی دەهێڵی وەهەتا دەتوانیت بەهێزبە بەرامبەر ئەوخۆشگوزەرانیانەی دێنە پێشت لەژیاندا.

• چۆنی لەدنیادا بۆخۆت ببە، ووریابە بۆ دنیا نەبیت، بەڕاستی کەدۆستایەتی کردنی دنیا بەرەو دڵخۆشی و دڵنیایت بات، دەبێت ناخۆشیەکانیشی بچێژی و توشی سەغڵەتی و نارەحەتیەکانی هەردەبیت تیایدا.

• هەرجارێك لەشتێكدا سەركەوتووبیت و پێداگیری لەسەربکەیت دەبێت بزانیت گۆڕانیشی هەر بەسەردا دێت، سەركەوتن تیایـدا ڕۆچـوونەو هەرچـەندە سوودو قازانجی هەبێت سبەینێ هەر ڕووخاو زەرەرمەندییە.

• خۆشگوزەرانی تیایدا دەتگەیەنێتە بەڵاو كارەسات، مانەوە تیایدا دەتبات بەرەو نەمان، خۆشیەكانی تێكەڵن لەخەفەت و كۆتـایی ژیانـت تیایـدا لاوازی و پیریە.

• واسەیری بكە، سەیركردنی دنیا نەویستێكی واز لەدنیا هێنەر، ڕوانینێكی عاشقانەو دڵخوازانە بۆی مەڕوانە، بزانە كەئەم دنیایە، دانیشتوان و نیشتەجێكانی نامێنن بێئاگاو بێباك تووشی بەڵاو لێقـەوماوی دەكـات و داخ دەنێـت بەدڵیـدا، بەخۆزگەو بریا لەدەست چووەكانت ناگەڕێنەوەو دەڕوات، ناشـزانیت لەمـەودا چیت بەسەردێت و لەدوا ڕۆژدا چی چاوەڕوانیت ئەكات؟! ..

وەدەفەرموێت:

• ئەم دنیایە خانەی كاركردنە، كێ كەم دۆستایەتی بكـات و پشـتی تـێ بكات ئەوا بەو كەمە دۆستایەتییەی بەختەوەرو سوودمەند دەبێـت، هەركەسـیش پڕبەدڵ و بەهەوەسی خۆی خۆشیبوێت ودۆستایەتی بكات، ئەوا تیایـدا هـیلاك و ماندوو و بێ ئارام دەبێت.

• دنیا كاروباری بچووكە و چێژو ڕابواردنەكانی كـەم خایـەنن، سـەوزو ئاوەدانكراوە، خوای گـەورە خـۆی خـاوەن و میراتگریـەتی و خـەڵكی دنـیایی بەردەوام لەهەوڵدان بۆگەیشتن بەماڵ و هەوارگەو دەبێت هەر بەجێشی بهـێڵن، خۆت بپارێزە لەو نیشتمانە كەپـەرت و بـڵاوی و كـردەی ناپێویسـت یـەكجار زۆرە.

• ئەی نەوەی ئادەم: هەمم و غەمت بۆ دنیا نەبێت و مەیلت بەلایدا مەبە، بەڕاستی هەوارگەیەکی خراپ و نالەبارە بۆ ئەهلی خۆی و بەرەوپەشیمانیەکی دوورو درێژ و سزایەکی توندی دەبات.

• ئەی نەوەی ئادەم نەکەیت بەدنیا فریو بخۆیت و بێئاگابیت، هەرگیز دڵنیامەبە لەخۆشی و ئارامییەکانی چونکە مەترسی و کاروباری پڕ لەدەردی سەری زۆرت لەبەردەمەو لەکۆڵت نابنەوە.

• بەبێ شك لەورێیەی پێیدا دەڕۆیت توشی کارو ئەرکی زۆرو سەغڵەتی دەبیت، جا یان ئەوەتا لەشەڕیان ڕزگارت دەبێت و لەمەترسیەکانی پارێزراو دەبیت، یان تووشی لەناوچوون دەبیت و دەکەویتە هەوارگەوماڵێکی ترسێنەر و بەئاگاهێنەرو دڵ تەزێن، جا لەبەرئەوە ئامادەبەو لەو شەڕە ڕاکەو بەوەندە دەوڵەمەندی و ڕابواردنەکەمەی مەخەڵەتێ و خۆت لەناومەبە، دەرونت بۆی نەجۆشێت، زۆر زوو تۆڵە لەتەمەنت دەستێنێت و کتوپڕو خێرا دەگەیتە وادەی مردن.

• کارت دوامەخەو هەر مەڵێ: سبەینێ سبەینێ، تۆ نازانیت کەی دەگەڕێیتەوە بۆلای خوا، ئەوکات هیچ بەڵگەیەکت نییەو بروبیانووەکان زەق و دیارن و هەموو ماف و مەبەستێك لەو ڕۆژەدا کردەوەکانە، ئینجا خوای باڵادەست لەوێ کاری بەندەکانی جێبەجێ دەکات و کۆتایی پێدەهێنێت بە دوو جۆر:

١- ڕەحمەتی خۆی بۆدەکاتە سێبەرو دەیخاتە نازو نیعمەتی نەبڕاوەوە.

٢- یان دەبێت سزاو تۆڵەی تاوانەکان بچێژێت و تەنها پەشیمانی و کەساسی بۆدەمێنێتەوە.

• دەبێت هەموو كەسێك ئەوە بزانێت و لێی ڕوون و ئاشكرا بێت سەرەنجام هەردەگات بەو ڕۆژە، ئەوەش بزانێت كە ئەگەر لەچاوی ئەودا بچووك بێت ئەوا لای خوا بچووك نییە، ئەگەر لای ئەو زۆرگەورە بێت ئەوا لای خوا ئەوەندە گەورە نییە.

• خۆت لەدنیا بپارێزە، بەڕاستی دڵنیاییەكەی درۆزنە، هیواو ئاواتەكانی بۆش و بەتاڵن، گوزەرانی تاڵ و ناخۆشە، دڵ پێخۆشبوونی بەدبەختییە، تۆ لەوێدا لەخەتەردایت، یان بەهرەو بەخششێكە لەناو دەچێت، یان بەڵاو كارەساتێكە دادەبەزێت، یان كەساسییەكی پڕ ئازارە، یان خۆزگەو خواستێكی ڕووخاوە، ئەوەی ژیرو بەئاوەز بێت ئەوا زەحمەتی تێدا دەدات و بەرەنجی شان دەژیەت، ئەوەی تیایدا ئاسوودە بێت لەمەترسیدایە، بەڕاستی ئەوەی فێرت دەكات كە دنیاشەڕو خراپەیە ئەوەیە كەخوای گەورە دەیكاتە جێگای تاقیكردەوەی پێغەمبەرانی"علیهم السلام"و خۆشەویستانی، وەبۆ غەیری ئەوان ئاسانەو گومان تیایدا بەرەو هەڵدێرو خەڵەتاندنیان دەبات و شەیدای دەبن وادەزانن بەهۆیەوە بەڕێز دەبن.

ئەوەیان لەبیر كردووە كەپێغەمبەر محمد ﷺ وحەزرەتی مووسا "علیه السلام" قسەو گفتوگۆیان لەگەڵ خوای خۆیاندا كردووە كەچی تەماشا دەكەیت حەزرەتی محمد ﷺ بەردی توندی لەسكی خۆی بەستووە لەبرساندا، وە حەزرەتی(مووسا) ش "علیه السلام"ژێر پێستی سكی خۆی دەبینی شین هەڵگەڕابوو لەبەر لاوازی و بێ گۆشتی. گێڕانەوەكان دەڵێن: خوای باڵادەست وەحی بۆ نارد كە: ئەی مووسا "ئەگەر گەیشتیت بەهەژاران، بڵێ: سڵاوتان لێبێت بەدروشمی پیاوچاكان، واتە وا پێشوازییان لێبكە، وە ئەگەر گەیشتیت بە دەوڵەمەند بڵێ: سزای تاوان زۆر بەخێرایی دێت".

ئەگەر دەتەوێت بزانیت حەزرەتی عیسا (علیه السلام) لەچ بارێکی سەرسورهێنەردا بووە: ئەو دەیفەرموو: پێخۆرم برسێتییە، درووشمم لەخوا ترسانە، بەرگ و پۆشاکم خورییە، سوارییەکەم پێیەکانمە، ڕوناکیم لەشەودا شەوقی مانگە، گەرمی بەخشم لەزستاندا تیشکی خۆرە، میوەو ڕەیحانم ئەوەیە بۆ بێ زمان و ئاژەڵەکان لەزەویدا دەڕوێت، ئینجا وادەزانم کەس لەمن دەوڵەمەندتر نییە.

حەزرەتی سلێمانی کوڕی حەزرەتی داود (علیهم السلام) خواردنی تایبەتی خۆی نانی جۆ بووە، خواردنێکی زبری هەبووە، بەرگی مووی دەکردەبەر، ئاردی بێژراوی دەدا بەخەڵك، کە شەویشی بەسەردا دەهات دەستەکانی لەملی خۆی دەئالآند و تا ڕۆژ دەبووەوە دەگریا.

ئەوانە بەم شێوەیە لەدنیادا ژیاون، دنیا لەچاوی ئەواندا زۆر بچووك بووە، پشتیان تێکردبوو بەوپەڕی دنیانەویستیەوە تیایدا بە ئارام و لەسەرخۆ بوون، بەردەوام لەڕنج و زەحمەت و ماندوویدا بوون، زۆرجوان بیریان دەکردەوە، سەیری سەرەتای دنیایان نەدەکرد بەڵکو دەیانڕوانی بۆ دوادوایی دنیاو لەکۆتایی ژیانیان دەڕوانی و سەیری شیرینی و خۆشگوزەرانی سەرەتای دنیاو ژیانی خۆیان نەدەکرد.

• وەڵڵاهی هەرشتێکت هەبێت و پێت بدرێت لەدنیادا دەبێت هەقی خوای لێبدەیت و پابەندبیت بەفەرمانی خوا، دڵنیاش بە خوای گەورە لەبارەیەوە پرسیارت لێدەکات.

• هەر بۆیە ژیرو تێگەیشتوو ئەوکەسەیە داوای شتێك ناکات لەئاستی هێزو توانایدا نەبێت و نەتوانێت جێبەجێی بکات

• بەڕاستی ئەگەر بیری لێبکەیتەوە ئەوا دنیا سێ ڕۆژە، ڕۆژێك" ڕابردووەو ڕۆیشتووە" ئاواتی بۆ مەخوازە، ڕۆژێکیش تۆ تیایدا دەژیت، پێویستە

تۆ ئەورۆژە دەوڵەمەند بکەیت، ڕۆژێکیش"دێت" کە تۆ نازانی ئایا لەئەهلی ئەو ڕۆژە دەبیت یان نا؟ نازانی پێش ئەوەی بێت دەمریت یان نا؟

بەڵێ "دوێنێ" کەئەو ڕۆژەیە کە ڕۆیشتووە، حەکیمێکی پەروەرشیارە" دوێنێ بۆ خۆی کەڕۆیشت بەڵام پەندو حیکمەتەکەی لەدەستی تۆدایە، ئەگەر بزری بکەیت و لەدەستت بچێت ئەوا دەگەڕێتەوە دوا، بەڕاستی کاتێکی زۆرت لێ ڕۆیشتووەو گەشتێکی خێراو پەلەت لەبەردەمە، هەروەها "سبەینێ"ش هیواو ئومێدێکە بۆ تۆ، متمانەت بەکارت هەبێت، وازبێنە لەخۆخەڵەتاندن بەهیواو ئومێدی"سبەینێ"، پێش لەدەستچوونی "ئێستا"ت ئاگات لێی بێت، تۆ دەچیتە ڕۆژێکەوە کە"سبەینێ"یە یا ڕۆژانی دوای"سبەینێ"، دڵنیابە خەم و خەفەت و ماندووبوونت زیاتر دەکەن، دەتەوێت لەڕۆژێکدا بەشی چەندین ڕۆژ کۆبکەیتەوە، هاوار لەخۆت، ئیش و کاری زۆر و زیادبوونی خەم و خەفەت و گەورەبوونی هیلاکی و ون بوونی بەندەکان، کارکردنە بەهیواو ئومێدی ڕۆژانی دواتر.

ئەگەر هیوابوون بە"سبەینێ"ت لەدڵتا بردە دەرەوە ئەمڕۆ لەکارکردنتدا چالاکتردەبیت، کاری ئەمڕۆ ناخەیتە"سبەینێ"، وەهیوابوون بە"سبەینێ" دەتبات بەرەو زیادەڕەوی، وات لێدەکات داواکاریت زیاتربێت، ئەگەر دەتوانیت دنیا کورت بکەیتەوە بۆ"سەعاتێك" لەنێوان دوو"سەعاتدا"، سەعاتێك "ڕابردووە" و"سەعاتێك" دواتر دێت و"سەعاتێك" کە تۆ ئێستا تیایدا دەژیت ئەو سەعاتەی ڕۆشتووەو ئەو سەعاتەی دواتر دێت هیچ خۆشیەك لەتام و چێژی شیرینییەکەیاندا نەماوەو هیچ ئازارێکیش لەناڕەحەتیەکەیاندا نەماوە.

بەڕاستی دنیا ئەو سەعاتەیە کە تۆ تیایدایت، ئەو سەعاتە لەخشتەت دەبات، لەبەهەشت بێبەشت دەکات و دەتبات بەرەو ئاگر، ئەگەر ژیرو

بەئاوەزی، "ئەمڕۆ"میوانێکە دێتەلات و دواتـر بەجێتـدەهێڵێت، ئەگـەر چـاکەت لەگەڵدا کرد ئەوا شایەتیت بۆ دەدات و ڕاستیەکە بۆ تـۆ، ووریابـە لێـرەدا دوو ڕۆژ وەکو دووبرای یـەك مـاڵ دێنـە لات، یـەکێکیان هـات پێشـوازی خراپـت لێکردوو بەچاکە داتنەمەزراند ئەوا لەنێوان خۆت و ئەودا دیارە، ئـەوەی تریـان دوای ئەو دێت و پێت دەڵێت مـن وا دوای براکـەم هاتوومەتـە لات، بەڕاسـتی چاکەکردنت لەگـەڵ منـدا خراپـەکاریت لەگـەڵ ئـەودا ڕەش دەکاتـەوەو لای دەبات، خۆشدەبێت لەوەی کردت لەگەڵیدا، بزانە "ئێستا" لەکیست نەچـووە، ئەگەر هەموو دنیا کۆببێتەوە ڕۆژێکـت بـۆ ناگێڕێتـەوە کـە ڕۆیشـتووە، ئەگـەر گۆڕستان بەگەورەترین شێوە دروستکرابێت، هیچی بۆ تۆ نییـە تـەنها ئەوەندەیـە کەپێت دەبڕێت و بەقەدەر تۆ دەبێت، ئەوەی تەمـەنی ڕۆیشـت لـەگۆڕدا پـێی دەڵێن دنیاکەت لەسەرەتاوە تاکۆتایی بۆکورەکەت بوو کە لەدوات بەجێ مـاوە تیایدا دەژیت لەدوای تۆو هیچی بۆتۆ نییە.

خۆشەویسترین شت بۆ تۆ ڕۆژێکە بەجێتهێشتووەو تیایـدا کـارت بـۆ نەفسی خۆت کردووە، جا ژیانت ڕۆژ ڕۆژ دابنێ و کاریان بۆ ئەو کاتە تیابکـە، خۆئەگەر ڕۆژەکانیش کورت بکەیتەوەو سەعات سەعات پۆلێنی بکەیت ئەوا بۆ تۆ باشتریشە.

ووتەی باش هەڵبژێرەو نەفست بەچـاکەوە پابەنـد بکـە، بەووریاییـەوە ئاگاداری حەسرەتی ئەو کاتەبە کە گیان کێشـانە، ئەوانـە ووتەیـەکن حەسـرەتی گیانکێشانت بیردەخەنەوە، بەڵکو بەهۆیەوە خوای گەورە ئێمە سوودمەند بکات و بۆ تۆش ئامۆژگاری بێت.

خوای گەورە عافیبەتی ئێمەو تۆش بەخێر بگێڕێت

والسلام علیکم

## تێڕوانینی پەروەردەیی لەبیری حەسەنی بەصری دا

نەتەوەی ئیسلام لەم چەند ساڵانەی دواییدا لەلایەن ڕۆڵەو نەوە دڵسۆزەكانیەوە هەوڵێكی باشی چالاكی بەخۆیەوە دیت بۆ زیندووكردنەوەی شارستانیەتێكی تازەو دامەزراو لەسەر بنەمای فێركاری و ڕێنمایی ئاڕاستەكاری ئیسلامیەكی بەرزو باڵا.

لەپێناوی ئەم زیندووكردنەوەیەدا چەندین سەرنج و ڕای زۆر خرانە ڕوو، وەهەوڵیاندا بۆ كردەیەكی پەروەردەیی و پەروەرشیاری كە بنەمایەكی باوەڕ پێكراو وپشت پێبەستراو دادەنرێت بۆ هەر ڕاپەڕین و بوژانەوەیەكی جێگەی هیواو لێوەشاوە بێت، وە بەدووربێت لەكۆمەڵێك تێڕوانین و بۆچوونی كەڵەكەبووی بەستراوە بەبیرو بۆچوونی ڕۆژئاوایی لەجیاتی پەیڕەوكردن و چاولێكردنمان لەئیسلامەتیمان.

ناچارین كەبەهیچ جۆرێك نابێت ئەو ڕاستییە لەبیربكەین كە كۆتاو دوادوایی ئەم نەتەوەی ئیسلامە چاك نابێت تەنها مەگەر بەوە نەبێت كەسەرەتا و دەسپێكی ئەم نەتەوەیەی پێ چاك بووە، وەئەوەی كەپێشینەكان لەزانایانی ئوممەت و پەروەردەكارو پەروەرشیارانێكی زۆر پێشكەشیان كردووە لە بۆچوون و بیرو باوەڕێكی وا كەوێنای یاساو بناغەیەكی بەرزو گەورەیە بۆ هەر پەروەدەیەكی ئیسلامی ڕاستەقینە.

حەسەنی بەصری لەبەناوبانگترین و دیارترینی ناودارانی ئەو قوتابخانە پەروەردەییە ئیسلامیە دەژمێردرێت، بەڕاستی دەری خستووەو ڕوونی كردوەتەوە بەگوتارو هەڵوێستەكانی دەربارەی بیرنامەی پەروەردەیی ڕەسەن و ڕیشە داكوتاو كە دەتوانرێت ئەو بیرنامەیەی ئەو لەدوو تەوەرەی بنچینەییدا كۆبكەینەوە كە زیادە نیەو پێویستە بۆ هەر پەروەردەیەكی ئیسلامی هەستیارو

زرنگ تا پێشکەشی بکەین بەهەر کەسێك کەسەرچاوەیەکی ئیسلامی پاك و بێگەردی بوێت و بەڕاستی ڕووی تێبکات، تا لێی بخواتەوەو شیلەو بەرامەی ئیمان بچێژێت.

## تەوەری یەکەم:

چاکی لەڕواڵەتدا بەندو گرێبەستە بەچاکی شاراوەی ناوەوە، کاتێك دڵ وەك فەرمانڕەوایەکی دەسەڵاتدارە لەسەر سەربازەکانی کەفەرمانیان بۆ دەردەکات، دەبێت بایەخێکی زۆری پێبدرێت بە ڕاستکردنەوەو ئاراستەکردنی بەر لەوەی خواناسان پشتی پێببەستن و متمانەی پێبکەن، دەبێت بڕوانە نەخۆشیەکانی و چارەسەری بۆ دابنێن، بەڕاستی ئەوە گرنگترین هەنگاوە کە خواناسان دەستی پێ دەدەنە خواناسی و دینداری.

خوای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت:

﴿يَوْمَ لَا يَنفَعُ مَالٌ وَلَا بَنُونَ* إِلَّا مَنْ أَتَى اللَّهَ بِقَلْبٍ سَلِيمٍ﴾[1].

پێغەمبەری خۆشەویست"ﷺ" دەفەرموێت: "ألا وإن في الجسد مضغة إذا صلحت صلح الجسد كله وإذا فسدت فسد الجسد كله ألا وهي القلب"[2].

وتەکانی حەسەنی بەصری زۆرو جۆراو جۆرن و باس لەوە دەکات کەبڕیاری ئەو یاسا پەروەردەییە شکۆدارە پابەندە بەپاك کردنەوەی دڵ لە "چڵك و ژەنگی هاوبەش بۆ خوا دانان و ڕق و کینەو حەسوودی و ناپاکی و.....هتد"،

---

[1]-الشعراء ٨٨-٨٩_ واتە :"ئەو ڕۆژەی نەماڵ سورد دەبەخشێت و فریای ئادەمیزاد دەکەوێت، نەمنداڵو نە نەوە، مەگەر کەسێك بەدڵو دەروونی پاك و بێگەردو پڕ لەئیمان بەخزمەت پەروەردگار گەیشتبێت".

[2]-متفق عليه- واتە:"لەجەستەی مرۆڤدا پارچەیەك هەیە ئەگەر چاك بێت هەموو جەستە چاك دەبێت و ئەگەر خراپ بوو هەموو جەستە خراپ دەبێت، بزانە : ئەو پارچەیەش دڵە".

وەچاك كردنی بە ئیمان و یەقین و هەستكردن بەچاودێری خودایی و گوێڕایەڵی كردنی فەرمانی خواو پەرستش و هەموو ئەو ڕەوشت و ڕەفتارانەی كە لەخوای گەورەمان نزیك دەكەنەوە.

حەسەن"ڕەحمەتی خوای لێ بێت" دەفەرموێت:

دڵەكانتان نوێ بكەنەوە بەڕاستی زۆر زوو دەپوكێتەوەو خاوو تەمبەڵ دەبێت، وەسەرزەنشت و هەڕەشە لەونەفسەتان بكەن كە بەڕاستی لەدەرفەت و هەلێك دەگەڕێت بۆ مەبەستی شەڕو خراپە.

وەدەفەرموێت: " چەندە باوەڕی تەواو بێت بەبەهەشت و ئاگر وە دڵنیابێت لەڕاستی و هەبوونیان، ئەوەندە ملكەچ و لەخوا ترس دەبێت و بەو مەبەستەوە بەردەوام دەبێت تامردن دەگاتە سەری.

دەفەرموێت: بەیەقین داوای بەهەشت دەكات و بەیەقین لەئاگر ڕادەكات، وەبەیەقین فەرزەكان بەتەواوترین شێوە بەجێدەگەیەنێت، وەبەیەقین ئارام لەسەر حەق و ڕاستی دەگرێت و دڵنیایە كەخێری زۆر هەیە لەلێبووردنی خوادا.

هەروەها دەفەرموێت: خەڵكی لەژیانێكی خۆشدان، لەهەمان كاتدا ئەگەر بڕوادار توشی بەڵایەك یان نەهامەتیەك هات ئەوا ئیمانی دامەزراوتر دەبێت، وە دووڕوو كە توشی بەڵاو نەهامەتی هات دووڕوویەكەی دامەزراوتر دەبێت.

وە ئەوانەی لەهەمووكەس زیاتر سوورن لەسەر پاكی و سەلامەتی دڵیان ئەوا كاتێك لەقسەكردن دەبنەوە یان دەیانەوێت هەستن دەڵێن:" خوایە دڵمان پاك بكەرەوە لە هاوبەشدانان بۆت وە لە خۆبەگەورەزانین و دووڕوویی و ڕیاو ناوبانگ و شك لەدینەكەت، ئەی هەڵسوڕێنەری دڵەكان دڵمان دامەزراوبكە لەسەر دین، ئاینەكامان كە ئیسلامە دامەزراو و بەهادار بكە".

لێرەدا دەردەکەوێت کە حەسەنی بەصری وا هەستدەکات و وادەبینێت کــە هــەر لادانێکــی تــاك لەباشــێتی و هەڵســوکەوت ووریــایی و دڵســۆزی، دەیگێڕێتەوە سەرەتاو نیشانەیە لەسەر نەخۆشــی دڵــی و کــەموکوڕی لەئیمانیــدا درووست دەکات، کەواتە ئەو بەرنامە پەروەردەییە یەکەم هەنگاوی چــاککردنی دڵە.

"العتبی" لەباوکیەوە دەگێڕێتەوە: ئیمامی حەسەنی بەصری بۆ"فرقد"ی نوسی(( ... وەپاشان: من ئامۆژگاریت دەکەم بە لەخوا ترســان و پارێزگــاری و کارکردن بەو زانستەی کەخوا پێی داویت، ئامادەباشی بۆ ئــەو بەڵێنــەی خــوای گەورە پێی داویت بەوەی کەفێڵ لەهیچ کەس نەکەیت لەپێــدانی بــەش و مــافی خۆی، دەمامکی بێئاگایان لەسەرت لابــەرەو ئاگاداربــە لەخــەوتنێکی نەفامانــەو، قۆڵی لێهەڵماڵە، بەڕاستی دنیا گۆڕەپانی پێشبڕکێیەو مەبەســتەکەش بەهەشــتە یــا ئاگر.

بڕوانە: بۆمن و بۆ تۆیش لەلای خوا مەقامێك هەیــە تیایــدا لــەمنیش و لــەتۆیش دەپرســرێتەوە دەربــارەی کــەم و بچــووك و ووردەکــاری و ئاشــکراو نهێنیەکان، دڵنیاو ئاسوودە مەبە لەوەی کە لەمن و تۆیش دەپرسرێتەوە دەربارەی وەسوەسەکانی ناو دڵو ڕوانینێکی چاوو گــوێ شــلکردن بــۆ ڕاگەیەنــدراوێك، وەبێ ئومێدیش مەبە لێی.

دەربارەی ئەوە دەفەرموێت: لوقمان بەکوڕەکەی ووت:" کوڕی خــۆم، کردەوە بەبێ یەقین ئەنجام نادرێت، هەرکەس یەقینی زیاتربێت کردەوەشــی زیــاتر دەبێت". وە فەرمووی : کوڕی خۆم، ئەگەر شــەیتان لەڕێگــەی درووســتکردنی شك و گومانەوە بۆت هات تۆ بەیــەقین ئامۆژگــاری بکــەو بەســەری دا زاڵبــە، کاتێك بۆت هات لەڕێگەی تەمبەڵی و بێزاربوونەوە، ئەوا تۆ بەهۆی بیرکردنەوە

لەناو گۆڕی تاریك و قیامەت بەسەریدا زاڵ بە، وەئەگەر لەڕێگەی حەزو ئارەزوو ترسانەوە بۆت هات، هەواڵی بدەیە کەدنیا هەربەجێ دەهێلرێت و تاسەر بۆکەس نییە.

ئیمام حەسەنی بەصری دەفەرموێت:" سەرمایەی بڕوادار دینەکەیەتی، کاتێك دینی ڕۆیشت بۆ خۆشی لەگەڵیدا ڕۆشت، چونکە لەو ڕۆیشتنەدا لێی جیانابێتەوەو ئەوکاتەش پیاوان متمانەیان لەسەرنامێنێت، لەو فەرمودەیەی خوا دوادەکەوێت:﴿ وَلَا أُقْسِمُ بِالنَّفْسِ اللَّوَّامَةِ﴾[1].

وەدەفەرموێت: بڕوادار بەهیچ ناگات مەگەر لۆمەی نەفسی خۆی لەسەر دەکات، ئەوە چیم گووت؟! ئەوە چی بوو خواردم ؟! ئەوە لەو کۆڕو مەجلیسەدا چیمکرد؟! بەم شێوەیە ....بەڵام گوناهکار، هەنگاوەکانی هەڵدێنێت بێئەوەی هیچ ڕەخنەیەك یان لۆمەیەکی نەفسی خۆی بکات.

هەروەها دەفەرموێت: ئارام بگرن و توندو تۆڵبن بەڕاستی چەند شەوو ڕۆژێکە، بزانە تۆوەکو سوارێك لەکاروانێکدا وەستێنراویت نزیکە یەك یەك بانگ دەکرێن، جا هەرکام بانگکرا وەڵام دەداتەوە و دەڕوات بێ ئاوڕدانەوە.

کەواتە بگەڕێنەوە سەرچاکە، چونکە ئەوە ڕاستە، تێکۆشەرترین خەڵك بەنێوان خۆیان و ئارەزووەکانیاندا ڕادەبوورن، بەڵام هەرکەس لەخەمی چاکەو دوارۆژی خۆیدابێت ئارام دەگرێت لەسەرئەم ڕاستی یە. حەسەن بەردەوام خەمباربووە، هەرگیز نەتدیوە مەگەر واتدەزانی کە بەڵایەکی بەسەرهاتووە.

"مسمع" دەڵێت: حەسەن بۆماوەی سی ساڵ پێ نەکەنیوەو چل ساڵیش گاڵتەو گەپی نەکردووە.

---

[1]- القيامة-٢: واتە: سوێند دەخۆم بەویژدانی زیندوو نەفسی ڕەخنە لەخۆگر کەلۆمەی خۆی دەکات.

حەسەن دەفەرموێت: بەردەوام بەندە لەخێردایە هەتا ئامۆژگاری نەفسی خۆی بکات، وەبەهیمەتەوە لێ پرسینەوەی لەگەڵدا بکات.

ئەوەی زیاتر بایەخ و شکۆی دا بەبەرنامەکەی حەسەنی بەصری لەپەروەردەدا ئەوەبوو ئەو سنوورەی بڕیبوو کەتەنها چەند ووشەیەکی ڕووت و پەتی بێت بانگەوازێکی وشك و بێگیان بێت، وە لەپێش هەموو کەس بۆخۆی پەیڕەوی لەوبەرنامە پەروەردەییە دەکردو پابەندی تەواوی هەبوو بەهەموو زانست و یاساکانی ئەو بەرنامەیەوە، ببووە پێشەنگێکی کاراو بەرهەمی دەرچووی بەرنامەکە، وەکو بانگخوازێك کە لەدڵی خەڵکدا خۆشەویست و بەرێز بوو، بەهەموو زمانێك باسی باشی ئەو دەکراو جێی تێرامانی هەموان بوو لەسەر دەستی ئەو ڕێنمایی دەکران.

"یونس کوڕی عبید" دەفەرموێت: کەسم نەدیوە وەك حەسەن کرداری لە گوفتاری نزیك بێت، وە دەفەرموێت: پیاو هەرکە دەڕوانێت بۆ حەسەن سوودمەند دەبێت ئەگەر کرداریشی نەبینێت و گوێش لەقسەکانی نەگرێت.

"ئیبراهیم کوڕی عیسا" دەفەرموێت: کەسم نەدیوە بەقەد حەسەن سام و هەیبەتی هەبێت.

لەسەر شتێك پرسیارکرا لەعطا و فەرمووی: نازانم ، ووتیان: حەسەن ووتوویەتی ئاواو ئاوا .... ئەویش فەرمووی: ئەو، وەڵڵاهی هاوشێوەی دڵی حەسەن لەسنگی مندا نییە.

"ئەبو جەعفەری باقر" هەرکە یادی دەکردەوە دەیفەرموو: ئەو کەسێك بوو قسەکانی لەقسەی پێغەمبەران دەچوو.

ئەوەتا "زەهەبی" لە مەوسوعەکەیدا "تاریخ الإسلام" دەربارەی ئەو دەفەرموێت: جوامێری و پیاوەتی یەکی زۆر، چاکەکاریەکی بەخوڕو بەرێزنە،

لوتكە لەزانست و فەرموودە، پێشەوایەكی تێكۆشەری زۆر تێگەیشتوو، لوتكە و چلەپۆپە لە قورئان و تەفسیر، لوتكە لـە ئامۆژگـاری و بیرخستنەوە، لوتكەلـە لەسەرخۆیی و ڕەوانبێژی، لوتكەو سەركردە لە پشتگیری و ئازایەتیدا.

### تەوەرەی دووەم:

ڕێگای ڕابەری و ڕێنمایی ڕێنیشاندان لەزانسـت و كـردەوەدا ئـەم بنەمایە لـەلای حەسـەنی بەصـری تـەوەری دووەمـە لەتـەوەرەكانی پـەروەردەو ڕاستییەكانی، كەبەهیچ شێوەیەك ناتوانێـت هـەق و ڕاسـتی و خێـر پێبگەیـەنێت مەگەر بەزانسـتێكی سـوودبەخش ئینجـا كـارپێكردنی، چـونكە پەروەردەیـەكی دامەزراو لەسەر نـەزانی و بـەبێ هـیچ بنەمایـەكی زانسـتی و درووسـت، زیـان لەخاوەنی دەدات و زەرەری زیاترە لەسوودەكەی، وەڕێك لەسەرابێك دەچـێت كە تینوو وادەزانێـت ئـاوە بـەڵام كاتێـك دەگاتـە سـەری هـیچ شـتێكی لێنیـە، وەبنەمای ئەم یاسایە لەدیندا فەرموودەی خوایە كەئەفەرموێت: ﴿قُلْ هَـٰذِهِ سَبِيلِي أَدْعُو إِلَى اللَّهِ عَلَى بَصِيرَةٍ أَنَاْ وَمَنِ اتَّبَعَنِي وَسُبْحَانَ اللَّهِ وَمَا أَنَاْ مِنَ الْمُشْرِكِينَ﴾ [1].

ڕازی دەڵێت: ئەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كە بانگكردن بۆلای خـوای بەرزو باڵا كاتێك چاكە و ڕێگە پێدراوە بـەو مەرجـەی لەسـەر چـاوكراوەیی و كارامەیی دەیلێت، وەلەسەر ڕێگای هیدایەت و یەقینبێت، ئەگەر وانەكرێت ئەوا پیاهەڵدانێكی لەخۆبایی بوانەیە.

---

[1]- یوسف/ ١٠٨، واتە: (ئەی پێغەمبەر"ﷺ"تۆبڵێ ئەمە ڕێگاو ڕێبازمە، من و شوێنكەوتوانم بانگ ئەكەین بۆلای خوای گەورە لەسەر بنچینەو بنەمایەكی ڕوون و ئاشكرا، پاك و بێگەردیش بۆ زاتی پەروەردگارە، من هیچ كاتێك لەموشریك و هاوەڵگەران نیم).

حەسەنی بەصری هەروەك و عادەتی خۆی لەپەروەردەدا بانگخوازی و پەروەرشیاریەتی لەنەفسی خۆیەوە دەست پێکرد بەو هەموو زانستە زۆرەی وەریگرتبوو کەسالآنێکی زۆر لەتەمەنی موبارەکی خۆی تێدا خەرج کردبوو.

ئەوەتا زانایانی سەردەمی خۆی شایەتی پێشەوایەتی ئەودەدەن، لەوانە:

ئەنەسی کوڕی مالیك"خوای لێ ڕازی بێت" کاتێك پرسیاری دەربارەی شتێك لێدەکەن، ئەفەرموێ: لەحەسەن بپرسن بەڕاستی ئەو لەبەریەتی و ئێمە لەبیرمان چۆتەوە.

بەکر مەزنی ئەفەرموێت: کێ ئەیەوێت تەماشای شەرعزانترین کەس بکات کەئێمە دیتبمان بابڕوانێتە حەسەن.

حەمیدی کوڕی عەبید ئەفەرموێت: شەرعزانی زۆرمان بینیوە بەلآم نەمان بینیوە کەسێك بەقەد حەسەن ئەوزانستەی تێدا کۆبووبێتەوە.

"ئەیوب ئەلسەختیانی" ئەفەرموێت: ئەگەر حەسەنت دەدیت دەتگوت هەرگیز لەگەڵ هیچ شەرعزانێك دانەنیشتووم.

"مەعاذی کوڕی مەعاذ" ئەفەرموێت: بە ئەشعەثم ووت ئایابە"عطا" گەیشتوویت پرسیارێکت هەبووبێت و لێت پرسیبێت؟ فەرمووی : بەهیچ کەس نەگەیشتووم دوای حەسەن ئیللا لەچاومدا لەو بچوکتربووە[1].

"ڕەبیع کوڕی ئەنەس" ئەفەرموێت: بۆماوەی"١٠"دە ساڵ هاتووچۆی حەسەنم کردووە، هیچ ڕۆژێك نەبووە ئەوەی لێمدەبیست پێش ئەوەی لێم بیستبێت.

ئبن و سەعید لە"طبقات"دا دەڵێت: حەسەن توانیبووی زانست و کردەوە بەیەکەوە کۆبکاتەوە، زانایەکی بەرزو شەرعزانێکی باوەڕ پێکراوو

[1]-لێرەدا مەبەست گەورەیی زانستە نەك تەمەن.

خواپەرستێکی دنیانەویست و خێردار، خاوەن زانست و کردارێکی زۆر، زمان پاراو و جوان و شۆخ بوو، کاتێك هاتبووە مەککە بینیم لەسەر جێگایەك دانیشتبوو زانایان بەدەوریدا دانیشتبوون و خەڵکیش کۆببوونەوە لێی و ئەویش قسەی بۆ دەکردن.

حەسەن زانایەك بوو کاری بەزانستەکەی دەکرد، بەڕاستی باخچەیەك بوو لەزانست و زانیاری، هەتا وایلێهاتبوو ببووە گەورەی خەڵك لەڕەوشت و ڕەفتاردا.

قەتادە ئەفەرموێت: هیچ کەسم نەدیوە چاکترو جوامێرترو تەواوتر لە حەسەن"ڕەحمەتی خوای لێ بێت"، ئەگەر شتێکی کڕیبوایە نرخەکەی درهەمێك شتێك کەمتربوایە، ئەو درهەمی تەواوی دەدا بەفرۆشیارەکە، وە ئەگەر بایی نۆ درهەم و نیوبوایە ئەو "١٠"دە درهەمی تەواوی دەدایە لەجوامێری و تێری و تەواوی خۆی، وە ئەیفەرموو: دینداری بەبێ چاکەو پیاوەتی ناکرێت، وە ئێسترێکی بۆ خۆی فرۆشت کڕیارەکە پێی ووت: ئەبو سەعید ئایا شتێك بۆ من دانانێیت -واتە لەنرخەکەی کەم ناکەیتەوە؟- حەسەن فەرمووی: با پەنجا درهەم بۆ تۆبێت، ئایا بۆت زیاتر بکەم؟ ئەویش ووتی: نەخێر بەوە ڕازیم، خوا بەرەکەت بخاتە ماڵتەوە.

یونس دەگێڕێتەوە: کە حەسەن داهاتی خۆی بەش دەکردو دەیدا بە موحتاجەکان، کەسوکاری حەسەن ووتیان ئێمەش پێویستمان پێیەتی، ئەویش ووتی: ئەگەر زیادبوو ئەیدەم بەئێوە.

وە دەیووت: حەسەنی بەصری خێری پێوەنییە ئەگەر ئاوا ڕەفتار نەکات، وەکاتێك کاروباری موسڵمانانی بەدەستەوە گرت هیچ پارەو ڕاتبی لەسەر وەرنەدەگرت.

"مطر" لـەبارەی زوهـدی حەسـەن دەڵێـت: چـووین بـۆلای حەسـەن بۆماڵیان، دیتمان لەماڵەکەیدا هیچ شتێك نەبوو، نەپێخەف، نەمافور، نە حەسـیر، تەنها تەختەبەندێکی خەوی لماوی لیٰ بوو ئەوی لەسەربوو.

رۆڵـی حەسـەن لـەو کـردە پەروەردەیـەو ئاراسـتەکردندا دەبیـنین کەخاوەن هیممەتێکی گەورەبووەو بەهیچ جۆرێك کـولی و خـاوی وبێزاربـوونی نەبووە.

"عـەوام کـوڕی حوشـب" فەرموویـەتی: حەسـەن بەکـەس نەدەچـوو تـەنها بەپێغەمبەرێك دەچوو کە بۆماوەی"٦٠"ساڵ نەتەوەکـەی بـانگ دەکـرد بـۆلای خوای باڵادەست.

ئـەو وەك دکتۆرێـك وابـوو بـۆ دڵـەکان، کـە هـەم نەخۆشـیەکەی دەدۆزێتەوەو هەم دەرمان و چارەسەریشی بۆدیـاری دەکـات، ڕوانگەیـەك بـوو بۆدیاریکردنی خراپیەکانی ڕەفتـارو هەڵسـوکەوتی تاکـەکانی نەتـەوەو ئەوەشـی دەگەڕاندەوە بۆ هەڵەی پـەروەردەیی و وازهێنـان لەزانسـت یـان کـردەوە یـان هەردووکیان بەیەکەوە، باسی ئەو زانایانەی دەکرد کە لەدنیادا زانستەکەیان بـۆ کۆکردنەوەی ماڵو سامان بەکاردەهێنا.

ئەوەتا مالیکی کوڕی دینار ئەفەرموێت: بە حەسـەنم ووت زانایـەك کـە دنیای خۆشـبوێت سـزاکەی چـییە؟ فـەرمووی: دڵـی دەمرێـت ئەگـەر "دنیـای خۆشبوێت و بەکردەوە بۆ دوارۆژی داوای بکات"[1]، ئەوە بەرەکەتی زانستەکەی دەڕوات و تەنها وێناکەی لەسەر دەمێنێت.

[1]– واتە: ڕیاکاری، "لەبەرچاوی خەڵکدا کاری چاکە دەکات و داواکاری چاکەیە بەڵام مەبەستی خۆی ناوبانگ و سوودمەندبوونی دنیایە".

لێی دەگێڕنەوە کە بەلای ماڵی ئیبن و هوبەیرەدا تێپەڕی، کۆمەڵێك قورئانخوێنی بینی-کە لە شەرعزانەکانیش بوون- لەبەر دەرگاکەی دانیشتبوون، پێی ووتن: بەرگ و پۆشاکی نایابتان پۆشیوەو ڕواڵەتی خۆتان جوان کردووە ئینجا هاتوون لەبەردەرگاکانی ئەوان هەوڵ دەدەن و تێدەکۆشن؟!

ئینجا بەهاوڕێکانی وت: گومانتان چۆنە بەرامبەر بەو بەرگ و پۆشاك لەبەرانە؟! کۆڕو مەجلیسی ئەوانە لەکۆڕو مەجلیسی لەخواترس و پارێزکاران نییە، بەڵکو مەجلیسی گرەوبازییە، هەر لەسەر ئەوە فەرمووی: ئەم قورئانە کۆیلەو مندالکاریش خوێندویانەتەوە هیچ زانیاریشیان دەربارەی لێکدانەوەی نەبووە، یان کەسیش پێی نەگوتوون.

خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿كِتَابٌ أَنزَلْنَاهُ إِلَيْكَ مُبَارَكٌ لِّيَدَّبَّرُوا آيَاتِهِ وَلِيَتَذَكَّرَ أُولُوا الْأَلْبَابِ﴾[٢].

وەلەئایات و بەڵگەکانی ووردنابنەوە جگە لە شوێنکەوتوانی، بەلام وەڵڵاهی بە لەبەرکردنی پیت و نەمانی سنووری نیە.

هەیانە دەڵێت: قورئانم هەر هەموو خوێندەوە تاکە پیتێکم نەپەڕاندوو وون نەکرد، بەلام وەڵڵاهی لەڕاستیدا هەر هەمووی وونکردووە، چونکە قورئان نابینی نە لەڕەفتاریدا نە لەڕەوشت و کرداریدا، هی واشیان هەیە دەڵێت: لەهەناسەیەکدا سورەتێك دەخوێنمەوە نا وەڵڵاهی ئەوانە، نەقورئانخوێنن، نە زانان، نەدانان، نە وەرعیان هەیە، کەی قورئان خوێندن بەم جۆرە دەبێت، خوا نموونەی لەو جۆرە کەسانە لەناو خەڵکدا زیادنەکات.

---

[٢]- ص/٢٩، واتە: ئەم قورئانە کتێبێکی پیرۆزە دامانبەزاندووە بۆلای تۆ، بۆئەوەی ئایاتەکانی لێکبدەنەوەو بیری لێبکەنەوەو بۆئەوەی خاوەن بیرو هۆشەکان پەندو ئامۆژگاری لێوەربگرن و تێفکرن.

(عمرا القصیر) ئەڵێت: پرسیارم لەحەسەن کرد لەسەر شتێك و ووتم: شەرعزانان دەڵێن ئاواو.. ئاوا.. ئەویش فەرمووی: ئایا شەرعزانێکت بەچاوی خۆت دیوە؟ بەڕاستی شەرعزانی دنیا نەویست و خاوەن و زوهد لەدنیادا بەرچاو ڕوونە بەهۆی دینداری و بەردەوامی لەسەر بەندایەتی پەروەردگاری.

وە لەباسی ئەو دنیاویستانەی کە هیچیان بۆ کەسنین تەنها بۆ گیرفان و سك و ڕابواردنی خۆیانن، دەفەرموێت: پیردەبیت کە دەگەیت بەپیاوی وا: سپی، زمان درێژو چاو تیژ، دڵمردوو، بیٚ‌کردار، تۆ لەخۆی بیناتریت پێی، تەنها جەستەی دەبینیت دڵی نا، وە دەنگی دەبیستیت بەبێ هاودەنگی و هاودەمی کردنی دڵی ووشك بوەتەوە، زمانێکی بەبڕشتی هەیە، لەماڵێك دەخوات کە هی خۆی نییە، کاتێك لەسەر چلێسی و زۆر خۆری ژانە سك دەیگرێت لەسەر خزمەتکارەکەی دەگریت، وە فەرمووی: دەی خزمەتکار هەرسکارێك بێنە بۆی، ئایا جگە لەدینەکەت بەچی هەرس دەبێت ئەی هەژار؟

(فرقد) ئەفەرموێت: چوین بۆ لای حەسەن و وتمان: ئەی ئەبو سەعید ئایا لەچی"محمدی کوڕی ئەلئەهتەم" سەرت سوڕماوە؟ فەرمووی: ماڵو سامانەکەی.

وتمان: کەمێك پێشتر چووین بۆلای ئەو، خۆی هەڵدەکێشاو شانازی بەخۆیەوە دەکردوو پێی وتین: بڕواننە ئەو سندوقە"سندوقێکی لەلایەکی ماڵەکەی پیشاندایین" وە وتی: لەو سندوقەدا (١٠٠،٠٠٠) سەد هەزار دینار هەیە، زەکاتم لێنەداوە، سۆزی خزمایەتیم پێ بەجێ نەهێناوە، هیچ موحتاجێك لێی نەخواردووە، وتمان: ئەبو عەبدوڵا ئەی بۆکێت کۆکردوەتەوە؟ وتی: بۆ ترس و لێقەومانی زەمان و دڵڕەقی سوڵتان و زیادکردنی هاوڕێیان خزمان.

حەسەن وتی: بڕوانن، شەیتانەکەی لەکوێوە بۆی هاتووە، ترساندویەتی لەترس و لێقەومانی زەمان و نەبوونی هاوڕێ و دڵڕەقی سوڵتانەکەی؟

دواتر وتی: ئەی میراتگر فریو نەخۆیت بەوماڵ و سامانەی دوێنێ خاوەنی ئەو ماڵەتی فریودا.

ئەو ماڵەت بۆ هاتووە، هیچ پێوەی ماندوو نەبویت و ئارەقی ناوچەوانت بۆ نەڕشتووە، بۆت هاتووە لەکەسێکەوە کەکۆی کردوەتەوە جا ئایا بەڕێگایەکی ناڕەوا کۆی کردبێتەوە، یان لەهەق گیردرابێتەوە و خەرج نەکراوەو نەبەخشراوە، یان ....یان... .

حەسەن فەرمووی: لەڕۆژی دوایدا پیاو هەیە داخ و حەسرەت دەخوات لەسەر ماڵێك کەکۆی کردوەتەوەو ئینجا مردووەو بەجێی هێشتووە بۆ دوای خۆی، وە ئەو کەسەی بۆی بەجێماوە خوا چاکی بۆ هێناوەو ماڵەکەی لەکاری چاکەدا بەکارهێناوەو لێی بەخشیوەو لەڕێگای خێردا خەرجی کردوە بەم جۆرە ماڵ‌و سامانەکەی چووەتە تەرازووی غەیری خۆی.

* وە لەباسی هیممەت لاوازو پاڵ دەرەوەکاندا دەفەرموێت: قەومێك هەن بەئومێدی لێخۆشبوونی خواو بەهیوای ڕەحمی خوان تا لەدنیا دەردەچن هیچ کارێکی چاکیان نییەو هەریەکەیان دەڵێت: من گومانی باشم بەخوا هەیەو بەئومێدی ڕەحمی خوام، بەڵام ئەوانە درۆ دەکەن، ئەگەر گومانی باشیان بەخوا بردبا ئەوا کاریان دەکرد لەپێناوی خوادا، وە ئەگەر بەئومێدی ڕەحمی خوابان بەکرداری چاك داوایان دەکرد، بەبێ شك و گومان هەرکەسێك بچێتە بیابانەوە بەبێ خۆراك و بەبێ ئاو ئەوا لەناو دەچێت.

* وە دەیفەرموو: ئەی نەوەی ئادەم، ناگەیتە ڕاستییەکانی باوەڕ مادام عەیبێك لەخۆتدا هەیەو لەخەڵکی دەگریت، دەبێت دەستبکەیت بەچاککردنی

ئەو عەیبە لەنەفسی خۆتدا ئەگەر وابکەیت و چاکی نەکەیت ئەوا چارەسەری ئەو عەیبەت نەکردووە، بەڵکو عەیبێکی تریشت درووستکردووە، بەڵام کە هەوڵتدا بۆ چارەسەری ئەوعەیبەو لەنەفسی خۆتدا چاکتکرد، ئەوا کارت دەبێـە چاککردنی نەفسی خۆت، کە ئەو کەسەی بەم شێوەیە بێت لەخۆشەویسترینی بەندەکانی خوای گەورەیە.

* لەبابەتێکی تردا ڕوونی دەکاتەوە کەنرخ و بەهای ڕەفتارو کردار تەرازویەکی ڕاستەقینەیەو خەڵکی پێ هەڵدەسەنگێنرێت، وە دەفەرموێت: خەڵکی بەکردەوەیدا بناسەو تاقی بکەرەوە، واز لەگوفتارەکانیان بهێنە بەڕاستی خوای"عزوجل" گوفتار وەرناگرێت تەنها ئەوە نەبێت بەکردەوە بیسەلمێنێت کە ڕاستدەکات یان درۆدەکات، کاتێك گوێبیستی قسەیەکی باش دەبیت بەدوای خاوەنەکەیدا بگەڕێ و لێی بڕوانە بزانە قسەکەی لەگەڵ کردەوەیدا بەرامبەر دێتەوە، ئەگەر وابوو ئەوا چاکەو لەچاوی خوشك و براکانیشدا چاك دیاردەبێت، وەئەگەر گوفتارو کردارەکەی جیاوازبوون لەیەکتری، ئەوا تۆ چۆنی بۆدەچیت و بەچی دەچوێنی؟ یان چی ئەو لەتۆ شاراوەیە؟

ئاگاداربە تۆش و ئەویش فریو نەخۆن هەروەکو کوڕی ئادەمی فریودا، تۆ گوفتارو کردارت هەیە، کردەوەکەت ڕاسترە لەقسەکەت، وەتۆ نهێنی و ئاشکرات هەیە، نهێنییەکەت ڕاسترە لەئاشکرات، وە ئێستاو دوارۆژت هەیە، دوارۆژت ڕاسترە لەئێستات، وە لەکۆتایدا دەیسەلمێنێ کەڕۆڵی ڕەفتاری باش بەرهەمێکی پێویستکراوە بۆ زانستێکی سوودبەخش.

وە دەفەرموێت: ئەی نەوەی ئادەم وەڵلاهی کەقورئانت خوێندو باوەڕت پێی هەبوو و کارت پێکرد ئەوا لەدنیادا خەمت گەورە دەکات، لەخوا ترسانت توندتر دەکات، گریانت زیاد دەکات.

وەدەفەرموێت: بایەخ بەم دنیایە مەدەن وەڵڵاهی ئەوەی بەهای بۆ دانەنا ئەوا پێی دڵخۆش و بەختەوەر دەبێت، ئاگاداربە ئیسلام و ڕەفتار پابەندن پێکەوە لەدرووستکردنی کەسایەتی موسڵماندا.

* وەدەفەرموێت: لەنیشانەکانی موسڵمان: " بەهێزە لەدیندا، ووردبین و خۆڕاگرە لەنەرمونیانیدا، داناو پێگەیشتووە لەزانستدا، پەیوەست و بەندە لەبەزەیی و لەسەرخۆییدا، مافی دەوروبەر دەدات، لەدەوڵەمەندیدا چاکەو پاشەکەوت دەکات بۆ دنیاو دوارِۆژ، لەهەژاریدا ئارام و خۆڕاگرە، چاکەکارە لەکاتی دەسەڵات و بەتواناییدا، گوێڕایەڵو ئامۆژگارە، خاوەن وەرعە لەحەزو ئارەزووەکانیدا، لێبووردەو ئارامە لەتوندی و تووڕەییدا، داواو ئاوات و ئارەزووەکانی هەرزەکارانەنین، زۆربڵێ و دەم هەراش نییە، حەزی سێکسی بەسەریدا زاڵ نییە، مەیلی بەلای حەزو هەوەس بازیدا نیەو نابات، زمانی سەلامەتە بۆیە بەزمانی خۆی توشی بەلا نابێت، حەز لەپێشەوایەتی کردن لەدڵیدا نییە، لەنیەتەکانیدا کەمتەرخەم نییە، بەهۆی ڕژدی و چاوبرسییەتیەوە سووک نابێت".

** لەگەڵ ئەم هەموو بایەخدانە بەتواناو ڕۆڵی ڕەفتارو گرنگییەکەی، ئەم زانا پەروەرشیارە هەموو ئەو هەوڵانە ڕەتدەکاتەوە کەزیادەڕۆیی لەڕەفتاردا دەکەن لەژێرناوی بانگەواز و قوڵبوونەوە لەدیندا، وەدەبینیت کە ئەم بەتوندی ڕازاندنەوەیە هیچ خێرێکی تێدانییە.

"عمارة کوڕی مەهران" فەرمووی: لەلای حەسەن بووم تێگوشینی دەخوارد، "فرقد" هاتەلامان حەسەن فەرمووی کرد بۆ خواردن لەگەڵیدا، بەڵام "فرقد" وتی: دەترسم لەسەر ئەم خواردنە نەتوانم سوپاسگوزاربم، حەسەن فەرمووی: هاوار لەخۆت! دەبێت لەسەر ئاوی ساردیش سوپاسگوزاربی بکەیت.

ئەوەش ڕەتدەکاتەوە کەلاف و گەزاف لێـدرێت بەبەرنامـەی فـەرمان بەچاکەو نەهی لەخراپـە بـەجۆرێك بیگەیەنێتـە ئـەو ڕادەیـەی شـیرو تـیر لـەبرا موسلّمانەکەی هەلّبگرێت، ئەوەتا پێغەمبـەر"ﷺ" ئەفـەرموێت:"ڕوخانـدنی دنیـا لەلای خوا کەمترە لەکوشتنی موسـلّمانێك بـەناڕەوا"[1]، هـەروەها ئەفـەرموێت: "لـەدوای من نەگەڕێنەوە سەر بێباوەڕی و بەگژیەکتردا نەچن و لەگـەردنی یـەك مەدەن".

کـاتی ئاژاوەکـەی نێـوان حـەجاج و عبـدالرحمن کـوڕی ئەشـعەث، "عوقبەی کوڕی عبدالغفار و ئەبوجەزاو عبداللە کوڕی غالـب" کـە لەدەسـتەی "کوڕی ئەشعەث" بوون چوون بـۆلای حەسـەن و وتیـان: ئـەی ئەبوسـەعید تـۆ دەلّێیت چی لـەکوشتنی ئـەو سەرکەشـەی کـەخوێنی بەحـەرام ڕشـتووەو مـالّی حەرامی وەرگرتووەو تەرکی نوێژی کردووە.. واو وای کردوەو ..؟

حەسەن فەرمووی: ئەبینم ئەگەر نەیکوژن و لێی گـەڕێن بکەوێتـە بـەر سزای خوا، ئێوە ئەتانەوێت سزای خوایی بەهۆی شیرەکانی ئیوەوە بێت؟ ئەگـەر بەلاّهەبوو ئارامبگرن تاخوا حوکم ئەدات، ئەوەی لەسـەر ئێوەیـە خـۆڕاگری و پاڕانەوەیە، ئەوان ڕۆشـتن و ئـەیانوت: ئـەو چارەسـەرەمان نەویسـت، چـوون لەگـەلّ"کـوڕی ئەشـعەث" داو بووبەجـەنگ لـەنێوان ئـەوان و حـەجاج بەسەربازەکانیەوە، سەرەتا زۆریان لێکوشتن وە بە" کوڕی ئەشـعەث "یـان وت: دلّخۆش بە بـەو کوشـتارەی کـە لـەدەورتکرا ئـەوە وەکـو کوشـتاری دەوری وشـترەکەی "عائیشـە" وابـوو، حەسـەن چـووە دەرەوەو پێـی وتـن: کـە ئـەو دەرچوونەیانی پێناخۆشبووەو ئەم جەنگەی پێچاك نەبوو.

---

[1]- ترمذی و نەسائی بەڕشتەیەکی ساغ گێراویانەتەوە.

* "إبن عەون" ئەڵێت: چاوم بەحەسەنی بەصری کەوت لەنێوان هەردوو جسرەکەدا بوو عەمامەیەکی ڕەشی لەسەربوو ئاگایان لێ نەبوو کە خۆی لەهەندێك ئاوی ئەو ڕووبارانەشدا هەتا لێیان ڕزگاربوو ئەوەندەی نەمابوو لەو ڕۆژەدا ئەویش لەناوبچێت.

بەم شێوەیە حەسەنی بەصری بەرنامەیەکی پەروەردەیی تێرو تەواو و ڕەسەنی پێشکەش بەنەوەکان کردووە، وەکو نورێك ڕێگەو ڕێبازی پێشینەکانی ڕووناك کردوەتەوە ئایا خەڵکی ئێستا و ئەم سەردەمە لەم نورو ڕۆشناییە سوود وەردەگرن و دەگەنە ئەم ڕووناکییە؟!

## پەیام و بانگەوازێک لەحەسەنی بەصرییەوە بۆ نەوەکانی ئادەم

* ئەی نەوەی ئادەم: ئاگات لەکردەوەت بێت، کردەوەت بەڕاستی ئەوە گۆشتی تۆیە وە خوێنی تۆیە چاوەڕوانبە، بەهەر چەشنێك بێت بەکردەوەت دەگەیتەوە.

* لەو سیفات و ئاکارانەی ئەهلی تەقوای پێدەناسرێن:

لەقسەکردندا ڕاستگۆیە، وەفادارەو پەیمان و بەڵێن دەباتەسەر، سۆزی خزمایەتی بەجێ دەگەیەنێت، بەزەیی بەبێ دەسەڵات و نەداراندا دێتەوە، کەم خۆ دەرخەرەو خۆهەڵکێش نییە لەناو خەڵکدا، ڕەفتارو هەڵسوکەوتی جوانە، ڕووخۆش و ڕەوشت بەرزەو بەوەش نزیك دەبێتەوە لەخوا.

* ئەی نەوەی ئادەم: تۆ چاوەڕێ بە سبەینێ کردەوەکانت دێتەوە ڕێت خێرو شەڕت کێشانە دەکرێن، هیچ شتێك لەخێر بەکەم مەزانە ئەگەر بچوکیش بێت، چونکە تۆ دەیبینیتەوەو دڵخۆشت دەکات هیچیش لەشەڕ بەکەم مەزانە، دڵنیابە دەیبینیەوەو بەو هۆیەوە توشی ناخۆشی دێیت، خۆت بپارێزە لەگومڕایی و تاوان.

* خوا ڕەحم بەپیاوێك دەکات کە کاسبی حەڵاڵ بکات، بەخواستەوە لێی بەخشێت، چاکەو یارمەتی لێبکات و لێشی پاشەکەوت بکات بۆ ڕۆژی نەداری و برسێتی، دنیا بەوحاڵی بێئاگاییەوە دەڕوات کردەوەکانت وەك ملوانکەیەك لەگەردنتدا بەجێ دەهێڵێت، ئێوە خەڵکتان پێش خۆتان داوە، قیامەتیش ئێوە پێش خۆی دەدات، وا باشترینتانی پێچاوەتەوە دەی ئێوە چاوەڕێی چی دەکەن؟!

* ئەی نەوەی ئادەم: چاك بزانە تۆ پێکهاتوویت لەچەند ڕۆژانێك! هەرکە ڕۆژێك دەڕوات ئەوا بەشێك لەتۆ دەڕوات، ئەوە چۆن مانەوەیەکە؟! من کەسانێکم ناسیوە بەهەرشتێك لەدنیادا دەهاتە ڕێیان دڵخۆش دەبوون، بۆ هەر

شتێكیش لەدەستیان دەڕۆیشت داخ و ئاخیان نەدەخوارد، دنیا لەچاوی ئەواندا وەك خۆڵ وابوو، دەی ئێمە لەكوێی دنیادایین ئێستا؟!

* بەڕاستی بڕوادار بەردەوام لۆمەو سەرزەنشتی نەفسی خۆی دەكات

دەڵێت: ئەوە چ قسەیەك بوو كردم؟

دەڵێت: نازانم ئەوە چی بوو خواردم؟

دەڵێت: ئەوە چییە؟ نەفسم چی ئەڵێ؟

نابینی ئیللا سەر زەنشتی خۆی دەكات ...

بەڵام خراپەكار: پەنا بەخوا لەخراپەكار ئەو هەنگاوەكان دەنێت بێ ئەوەی لەنەفسی بپرسێتەوە، بێ ئەوەی ڕەخنەیەك لەخۆی بگرێت، هەتا دەكەوێتە ناو چاڵەكەیەوە، ئینجا لەوێدا دەڵێت: ئەی هاوار لەو كارەساتەی تێی كەوتم

ئای خۆزگەم ...

ئای خۆزگەم ...

خۆزگە دەخوازێت و پەشیمانە لەكاتێكدا هیچی بۆناكرێت !!

* ئەی نەوەی ئادەم:

خۆت بپارێزە لەستەم، بەڕاستی ستەم تاریكایی ڕۆژی قیامەتە، لەڕۆژی دواییدا خەڵكانێك دەهێنن بەچاكەی ئەوەندە زۆر بەقەد كێوان، بەڵام بەردەوام لێیان وەردەگیرێتەوە هەتا هی وایان هەیە مایەپووچ دەمێنێتەوە، ئینجا ڕادەكێشرێتە ناو ئاگرەوە؟!

* ئەی نەوەی ئادەم ..

ئەگەر پیاوێکت دیت پێشبڕکێ لەدنیادا دەکات، تۆ پێشبڕکێی ڕۆژی دوایی لەگەڵدا بکە.

* ئەی نەوەی ئادەم ..

دەروونت پاك ڕابگرە، بەردەوام بەڕێزەوە بڕوانە خەڵکی و بەڕێزەوە هەڵسوکەوتیان لەگەڵدا بکە، خەڵکیش بەردەوام ڕێزت لێدەگرن.. مەبە بەکۆسپ لەبەردەم خواستەکانیاندا، مەبە بەهۆکار بۆ لەدەستدانی ئەوەی هەیانە، چونکە ئەگەر وابکەیت سووك سەیرت دەکەن، ڕقیان لەقسەکانت دەبێتەوە، قین لەدڵ دەبن بەرامبەرت.

* ئەی خەڵکینە: لەخۆشویستندا ئاسانبن، وە لە ڕقوقیندا ئاسانبن، هەندێك کەس ئەوەندە لەخۆشویستندا ڕۆدەچن هەتا بەهیلاك دەچن، وەهەندێك کەسیش ئەوەندە لەڕق و قیندا زیادەڕەوی دەکەن هەتا بەهیلاك دەچن.

* ئەی خەڵکینە: ئەگەر هیچ گوناهێکمان نەبێت تەنیا دنیامان خۆشبوێت، ئەوا با لەنەفسی خۆمان بترسین لەسەر ئەو خۆشویستنە، ئەوەتا خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿تُرِيدُونَ عَرَضَ الدُّنْيَا وَاللّهُ يُرِيدُ الآخِرَةَ وَاللّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾الأنفال ٦٧ واتە:" ئێوە کەل و پەل و شتومەکی دنیاتان دەوێت؟ لەکاتێکدا خوا سەرفرازی ئەو جیهانی ئەوێت و قیامەتی مەبەستە"، خوا ڕەحم بەوانە دەکات، ئەوەیان دەوێت و مەبەستیانە کەخوای گەورە دەیەوێت و مەبەستیەتی.

* ئەی خەڵکینە: بەڕاستی کاتێك پیاوێك داوای زانستی دەکرد، ئەوە لە تێڕوانینیدا دەبینرا، لەملکەچی و ڕێزداریدا،

لەزمانیدا ..

لەدەستیدا ..

لەنوێژیدا ..

لەبەجێ هێنانی سۆزی خزمایەتیدا ..

لەزوهدو پارێزگاریدا

بەڵام ئێستا .. !!

زانست بوەتە "تەڵەو داو" هەموو ڕاوی پێدەکەن یان پێی ڕاو دەکرێن !

مەگەر یەکێك خوا ڕەحمی پێبکات، کە ئەوانەش کەمن.

((واخەریکە سەرچاوەو کانی و کارێز دەبن وون

زەوی قووتیان دەدات و دەریاچەش ووشك دەبن!

خۆبەخۆ یەکتر ڕاودەکەین   تێڕوانینمان زۆر لێك دوورن

کارو فرمانێك بێتە ئاراوە   لەپێچانەوەی ئازاو جەسوورن

بچووکمان پاکیزەیە   گەورە بەپێچەوانە ...

پێشەواکانمان بەکاردەهێنرێن بچووك بێ کارو فرمانە

بەرگ و پۆشاك ڕازاوە تەنك و چنراو جوان

بوەتە جێگەی بایەخ و تێڕوانین و سەرنجان

لەژێر جۆرەها ناودا   زۆرداری کراوە ڕەوا

بەستەمی پەردەپۆش   کارمان بەرێوە دەڕوا

بیرو ڕا جیاوازەکان   پەرش و بڵاون هەردەم

ڕوولەیەك وەردەگێڕن   ڕێك ناکەون نابن جەم

وتار بێژەکانیشمان   بەسووکی سەیر دەکرێن

بەردەوام و هەمیشە   عاقڵانە زەبوون دەکرێن

دڵەکانیش بەردەوام   دەبرێن بۆچەوتی و لاڕێ

فریو مەخۆ هاوڕێکەم   دان بەڕاستیدا بنێ ..))

* من کەسانێکم دیوە، دنیا لەلایان لەخۆڵ کەمتربووە، وە کەسانێکیشم دیوە ئێوارە لەهەریەکێکیان هاتووە تەنها بەشی ئەو ژەمەیان بووە! ئەیانووت: هەمووی نانێمە ناو سکم، بەڵکو هەندێکی لێ دەبەخشم بۆخوای"عزوجل"! وەلەو بەشە ژەمە هەندێکیشی دەبەخشی، لەکاتێکدا بۆخۆی پێی موحتاجتربوو لەو کەسەی کەپێی دەبەخشی .

* ئەی خەڵکینە: دنیا خانەی کارە، کێ پشت بکاتە دونیاو دۆستایەتیەکی کەمی بکات، بەو کەمە دۆستایەتیە بەختەوەر دەبێت و سوودی لێدەبینێت، وەهەر کەسێکیش بەویست وحەزەکانی دۆستایەتی لەگەڵ دنیادا بکات و خۆشیبوێت، ئەوا بەهۆیەوە شەکەت و ماندوو دەبێت، بەڵام لەکوێن ئەو دڵانەی هەستدەکەن و تێدەگەن؟

ئەو چاوانەی دەبینن؟

ئەو گوێیانەی ئەبیستن؟

ئەوانەتان کە ئەبیستن لەکوێن ؟!! ئایا نەتانبیستووە کەخوا"عزوجل" ئاگادارە بەسەر بەندەکانییەوەو چاودێریان دەکات وە لەکتێبەکەیدا بۆی ناردوونەتە خوارەوە:

حەزت لەدنیا بێ تەنها بۆ ڕواڵەتی

ڕازی مەبە تیایدا دڵنیابی

وەپشتی پێ مەبەستە .. بەڵام ئەم ئایاتانە پشتگوێ خران و نموونە دەهێننەوە بۆ ڕەخنە لێگرتنیان، وەداوای شتی جیا لەوەدەکەن، حەزو ئارەزو بەلای شتی تریاندا دەبات،

* تێبگە ئەی لەخۆبایی..

بۆکاری ناشرین چوست و چالاکیت

بەڵام بۆچاکە نوستوو بێئاگایت
تەمبەڵی دەکەی تازە بەتازە !!
((دڵ بۆ خراپە گورج و کارایە ..
چۆن لەچاکەو خێر وا بێئاگایە
هاوار بەماڵت ئەی نەفس و دەروون ..
بۆگەنی دنیا چۆن ڕازی کردوون؟!..
وەها چاکترە ئەسرین بڕێژین ...
خەفەت بنۆشین حەسرەت بچێژین
فام بکەینەوە ببین پەشیمان
کفن بپۆشین سەیری گۆڕستان
ئارەزوو و هەوەس بکوژین تەواو
چۆن بوونە بتی ناو سنگ و هەناو..
گەشتی درێژخایەن لەبەردەممانە
دەگەینە مەنزڵ دوا هەوارمانە..
یان ناو ئاگری دۆزەخ و جەحیم...
یان بەهەشتەکەی نەبڕاوەو نەعیم
من سوێندت دەدەم چییە ئەم ژیانە
یان پلەو پایە یان نیشتمانە ...
هەڵخەڵەتێن و بۆیەکردنە ...
بۆچی شەیدای بووی هەر فریوخواردنە
بەسیە بۆ هەرچی و پەرچی درووستکاری
یان بۆ ستەمکار تاکەی هاوکاری..

لەناوچێ ئەو کۆگەلەی یەکتربڕو بێ باکن..

ناحەزو گێرەشوێن، بەخۆشیان دەڵێن چاکن

بەجۆرێکە لەناومان ناپاك سەردارو ئەمین

ئەمینیش بوەتە ناپاك بەڕاستی لێقەوماوین

ئەو خراپەکارانەی ماستاوچی و خۆپەرستن

ڕیاومەرایی کارن دەستیان بشکێ لەناوچن

ئەوانەش کە دووڕوویی بوەتە کردەو پیشەیان ...

ڕیسوای کردوون، لەناوچن، ڕوخسار تەڵخ و ڕەزاگران

لەناوچوون بۆ ئەو کەسەی بەهەشتی لەدەستدەدا

بۆ سەوزییەکی پەیناوی کەم تەمەنی ناو دنیا ..

***

* تێبگەن ئەی خەڵکی بێئاگا، کاروان واکەوتەڕێ، لەکاتی بەیانیدا ڕێبوارانی سوپاسگوزاری دەکەن ﴿أَفَأَمِنَ أَهْلُ الْقُرَى أَن يَأْتِيَهُمْ بَأْسُنَا بَيَاتاً وَهُمْ نَآئِمُونَ* أَوَ أَمِنَ أَهْلُ الْقُرَى أَن يَأْتِيَهُمْ بَأْسُنَا ضُحًى وَهُمْ يَلْعَبُونَ * أَفَأَمِنُواْ مَكْرَ اللّهِ فَلاَ يَأْمَنُ مَكْرَ اللّهِ إِلاَّ الْقَوْمُ الْخَاسِرُونَ﴾ "الاعراف ٩٧-٩٩"

واتە:"ئایا خەڵکی شارەکان لەوەدڵنیان و ناترسن کەتۆڵەی ئێمە بێت بۆیان لەشەودا لەکاتێکدا ئەوان نوستوون؟! ئایا خەڵکی شارەکان دڵنیاشن و ناترسن لەوەی تۆڵەی ئێمە بێت بۆیان لە چێشتەنگاودا، لەکاتێکدا ئەوان سەرگەرمی یاری و گەمەن، جا ئایا دڵنیاو بێباك بوون لەنەخشەو پیلانی خوا، (لەسەر ئاستی تاك و کۆمەڵ یان لەسەر ئاستی حکومەت و گەلان؟! جاکەس بێباك نابێت لەنەخشەو پیلانی خوا جگە لەقەومی خەسارەتمەندان نەبێت).

* بڕوادار ئەوەندە ترسی قیامەتی هەیە بەجۆرێك هەتا ئەڵێ: ڕزگارنابم! بەلاَم خراپەکار ئەڵێ: خەڵکی وەکو من زۆرن، خوا لێمخۆشدەبێت، گرنگ نییە بۆم، ڕەحمی خوا فراوانە!

تەواویکە ئەی لەخۆبایی، مەڵێ: واوەیلا بۆ نوێژ خوێنان!

﴿قَالَ عَذَابِي أُصِيبُ بِهِ مَنْ أَشَاء وَرَحْمَتِي وَسِعَتْ كُلَّ شَيْءٍ فَسَأَكْتُبُهَا لِلَّذِينَ يَتَّقُونَ وَيُؤْتُونَ الزَّكَـاةَ وَالَّذِينَ هُم بِآيَاتِنَا يُؤْمِنُونَ* الَّـذِينَ يَتَّبِعُـونَ الرَّسُـولَ النَّبِـيَّ الأُمِّـيَّ الَّذِي يَجِدُونَهُ مَكْتُوباً عِندَهُمْ فِي التَّوْرَاةِ وَالإِنْجِيلِ يَأْمُرُهُم بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَاهُمْ عَنِ الْمُنكَرِ وَيُحِلُّ لَهُمُ الطَّيِّبَاتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ الْخَبَآئِثَ وَيَضَعُ عَنْهُمْ إِصْرَهُمْ وَالأَغْلاَلَ الَّتِي كَانَتْ عَلَيْهِمْ فَالَّذِينَ آمَنُواْ بِهِ وَعَزَّرُوهُ وَنَصَرُوهُ وَاتَّبَعُواْ النُّورَ الَّذِيَ أُنزِلَ مَعَـهُ أُوْلَـئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ﴾ "الآعراف ١٥٦-١٥٧"

واتە: (( سزاو تۆڵەم توشی کەسێك دەکـەم کەبمـەوێت و"شایسـتە بێـت"، ڕەحمەت و میهرەبانیم هەموو شتێکی گرتوەتەوە، جا لەمـەودوا ئـەو ڕەحمـەت و میهرەبانیەم تۆمار دەکەم و بڕیار ئەدەم بۆ ئـەو کەسـانەی کەتـەقواو پارێزگـاری دەکەن و زەکات دەدەن و ئەوانەش کەباوەڕی تەواو بەئایەت و فەرمانەکانی ئێمە دەهێنن ...

ئەوانەی کە شوێنی ئـەم (محمـد"ﷺ") پێغەمبـەرە هەواڵـدەرە نەخوێنـدەوارە ئەکەون ئەوەی کە"گاورو جو، ناوو نیشانیان" دەستیان دەکەوێت نوسراوە لای ئەوان لەتەورات و ئینجیلدا، فەرمانیان پێـدەدات بەچـاکەو قەدەغـەی گونـاهو خراپەیان لێدەکات و هەرچیەك پاك و چاکە بۆیـان حـەلاَڵ دەکـات و هەرچـی پیس و ناپوختە لێیان حەرام دەکات و ئەرکە قورس و سەنگینەکان لەسەرشانیان لادەبات، ئەو کۆت و زنجیرانەش کە لەسەریان بوو لایـدەبات وەك "خۆکوشـتن لەکاتی تەوبەدا ...هتد" جا ئەوانەی باوەڕیان هێنـاوەو پشـتیوانییان لێکـردووەو

شوێنی ئەو نووره کەوتوون کە"قورئانە" و هاوڕێ لەگەڵیدا ڕەوانەکراوە هەر ئەوانە سەرفرازو ڕزگارن)).

* وە بیخوێنەرەوە ئەی لەخۆبایی!﴿إِنَّ رَحْمَتَ اللّهِ قَرِيبٌ مِّنَ الْمُحْسِنِينَ﴾"الاعراف ٥٦"

واتە: "بەڕاستی ڕەحمەتی خوا نزیکە لەچاکەکاران و چاکە خوازانەوە".

* بخوێنەوە ئەی لەخۆبایی:﴿ وَإِنِّي لَغَفَّارٌ لِّمَن تَابَ وَآمَنَ وَعَمِلَ صَالِحاً ثُمَّ اهْتَدَى﴾"طه ٨٢" واتە: (دڵنیابن بەڕاستی من زۆر لێخۆش بووم لەو کەسەی کە تەوبە دەکات و باوەڕ دەهێنێت و کاروکردەوەی چاکە دەکات لەوەودوا،"تا دوا هەناسەی ژیانی"بەردەوام دەبێت لەسەر ئەم ڕێبازە).

دیسان بخوێنەوە ئەی لەخۆبایی هەڵخەڵەتاو: ﴿فَاغْفِرْ لِلَّذِينَ تَابُوا وَاتَّبَعُوا سَبِيلَكَ وَقِهِمْ عَذَابَ الْجَحِيمِ﴾غافر٧ واتە:"کە وابوو خۆشببە لەوانەی کە تەوبەیان کردووەو لەگوناهەکانیان پەشیمانن و شوێن بەرنامەو ڕێبازی تۆ دەکەون، هەروەها لەئاگری دۆزەخیش بیانپارێزە".

بەڵام خراپەکاری لەخۆبایی نەفسی خۆی ئەخەڵەتێنێ، کردەوەی دوادەخات، گوایە هیوای بەخوای تەعالایە.. تیاچوون بۆ دنیاویستان، ئەوە دنیایە !!! وەڵڵاهی بەنوئیسرائیلی کە لەدوای خواپەرستی کەوتنە بت پەرستی، بەهۆی خۆشویستنیان بۆ دنیابوو.. وەڵڵاهی بەندە بڕوا ناکات بەئاگر ..تا ئەوەندە دەزانێت زەوی بەهەموو فراوانی خۆیەوە لەسەری تەسك بوەتەوە "دەچێتە ناو گۆڕ"، بەڕاستی دووڕووی هەڵخەڵەتاو، ئەگەر پێی بڵێت ئەوە ئاگرە لەودیوی ئەو دیوارەیە بڕوای پێ ناکات، هەتا بڵێسەکەی هێرش ئەکاتە سەری!

* دڵەکان .. دڵەکان لەڕاستیدا دڵەکان دەمرن وەدەژین

ئەگەر مرد: فەرزەکانیش بەبارگرانی ئـەزانێت لەسـەر خـۆی، ئەگـەر ئـەو دڵـە ژیایەوە، ئەوا کاراو دڵسۆزەو خۆبەخشانە ڕادێت.

* بڕوادار .. بڕوادار کامەیە؟ وەڵڵا بڕوادار ئەوکەسە نییـە کـە تـەنیا مانگێـك کردەوەی هەیە یان دوو مانگ یان ساڵێك، یان دوو ساڵ، ناوەڵڵا خوای گەورە هیچ وادەو کاتی بۆ بڕواداران دانەناوە.. جگە لە"مردن".

* گوناهەکان

ئایا گوناهەکان وەکو یـەك وان؟ پیـاوی وا هەیـە گوناهێـك ئەنجامـدەدات هەرگیز لەبیری ناچـێتەوە بـەردەوام و بۆهەمیشـە لێـی دەترسـێ، هـەتا ئەچـێتە بەهەشتەوە.

* دنیا .. وە خەمەکانی دنیا

داخ و حەسرەت لـەسەر شـتە لـەدەسـت چـووەکانی، حەسـرەتێك چـەندەها حەسرەتی تر دروسـتدەکات، بـڕوادار ئەگـەر داوای پێویسـتیەکی کـردو بـۆی جێبەجێ بوو، دەزانێت خـوای گـەورە بـۆی ئاسـانکردووەو سووپاسـی خـوای لەسەر دەکات، وە ئەگەر بۆی جێبەجێ نـەبوو .. وازی لێـدەهێنێت وە نەفسـی خۆی پێوە خەریك ناکات. ((عجبا لأمرالمؤمن إن امره كلـه خـير ولـيس ذلـك لأحد إلاالمؤمن إن أصابته سراء شكر، فكان خـيرا لـه وإن أصـابته ضـراء صـبرا فكان خيرا له) "رواه مسلم".

واتە:"کاری بڕوادار سەیرە کە کارەکانی هەمووی خێرە، ئەوە بۆکەسی تر وانییە جگە لەبڕوادار، کاتێك توشی خۆشی دێت سوپاسی خوا دەکات، ئـەبێ بـەخێر بۆی، وەئەگەر توشی ناخۆشی بوو ئارامی لەسەر دەگرێت، دەبێت بەخێر بۆی).

خۆشی و بەخشش و ئاسوودەیی دنیا بۆ بڕواداره، بۆئەوەی کاری خێری تێدا دەکات و توێشووی تێدا ئامادە دەکات بۆ چوونە بەهەشت، بەدبەختی و کەساسی و نائاسوودەیی دنیاش بۆ بێباوەڕو دووڕووەکانە کەتام و خۆشی ڕابواردنێکی کاتیی لێدەچێژن و تیایدا توێشوویەك ئامادە دەکەن بەرەو "ئاگر"یان ئەبات.

﴿فَمَن زُحْزِحَ عَنِ النَّارِ وَأُدْخِلَ الْجَنَّةَ فَقَدْ فَازَ وَما الْحَيَاةُ الدُّنْيَا إِلاَّ مَتَاعُ الْغُرُورِ﴾آل‌عمران ۱۸۵"

واتە: "ئەوسا ئەوەی دورخرایەوە لەئاگری دۆزەخ و خرایە بەهەشتەوە ئەوە بەڕاستی سەرفرازبووە، ژیانی دنیاش بێجگە لەوەی کە ڕابواردنێکی خەڵەتێنەرە شتێکیتر نییە".

بڕوادار بەڕێوەبەرە لەسەر نەفسی خۆی لەنەفسی خۆی دەپرسێتەوە بۆ خوای گەورە، دەزانێت کە لەڕۆژی دوایدا لێپرسینەوە ئاسانە، لەسەر کەسانێك کە لەدنیادا لێپرسینەوەیان لەگەڵ نەفسیاندا کرووە، بەڵام لێپرسینەوە توندو دژوارە لەسەر ئەوانەی بێ لێپرسینەوە دوای نەفسیان کەوتوون.

* ئەی خەڵکینە ئارامبگرن وەتوندو ئازابن، بەڕاستی ژمارەیەك شەوو ڕۆژەو هیچی تر، بزانن ئێوە وەکو سوارێکی دەست بەسەرن وا خەریکە یەکەیەکە بانگ دەکرێن و ئەوەی بانگکرا وەڵام دەداتەوەو ئەڕوات بێ ئاوڕدانەوەو ئیتر ناگەڕێتەوە، دەی بیری لێبکەنەوە، خۆتانی بۆ ئامادەکەن بەکرداری چاك.

ئەوە ڕاستە کە زۆر لەخەڵکی تێدەکۆشن، کەوتوونە نێوان خۆیان و ئارەزوو بازیەکانیان.

ئـەوەی ئارامبگرێـت لەسـەر ڕاسـتی ئـەوە بـۆ خـۆی باشـەو ئومێـدو هیـوای دوارۆژیەتی، تێبگە لەبێئاگاییت ئەی لەخۆبایی هەڵخەڵەتاو بگری لەسەر هەڵـەو تاوانەکانت.

ئەگەر "ئیبراهیم-علیه السلام-" بترسێت و ئەگـەر "موسـا-علیەالسـلام-" بترسێت و ئەگەر"عیسا-علیه السلام-" بترسێت وئەگەر"نوح-علیه السـلام-" بترسێت وە چاکترینی چاکان "محمد-درووودی خوای لێ بێت-" بترسێت، من چ کەسێکم کەنەترسم و نەگریم؟!

* بیربکەرەوە ئەی نەوەی ئادەم

ئایا هێزی شەڕکردنت هەیە لەگەڵ خوادا؟! بەڕاستی ئەوەی سەرپێچی فەرمانی پەروەردگاری کرد ئەوە لەگەڵیدا جەنگیوە!

ئەی فلان زۆر خـەمی چـاکە بخـۆ بـۆ ڕۆژی دوایـی، چـونکە پێتدەگاتـەوەو لەفریاتدێت، بگری لەچەند ساتێکی تەنیایدا، بەڵکو خوای گەورە لێتخۆشدەبێت و ڕەحم بەفرمێسك ڕشتنت دەکات، دەچیتە ڕیزی سەرفرازان

* ئەی فلان، زمانـت بـەیادی خـوا پـاراو بکـە، پێڵوەکانـت تەڕوشـێدار بکـە بەفرمێسك ڕشتن، لەترسی خوا .. وەڵلاهی هەرئەوەندە دەزانیـت دەگەیتـە دوا جێگەت ئەویش لەناو بەهەشتدا یان لەناو ئاگردا، لەوێ هەواری سێیەم نییە. سوننەت .. سوننەت با دەروونتان ببێتە هەوارگەی خۆشەویستی بۆی بەگەورەی بزانن .. بەسۆزەوە بۆی بڕوانن.

وەکو لەگێڕانەوەکاندا هاتووە: کاتێك میمبـەریان دروسـتکرد بـۆ پێغەمبـەری خوا"ﷺ" (قەدە دارەکە)[1] گریا! بەجۆرێكناڵەی ئـەهات.. بـەڵێ گریـا! چـۆن

[1] - پێش ئەوەی میمبەری بۆ دروست بکەن، پێغەمبەر ﷺلەتەنیشت قەدە دارێکی خورما کە لەمزگەوتەکەیدا بوو ، وتاری بۆ موسوڵمانان دەخوێندەوە.

گریانێك، هەروەکو کۆرپە کـە لـەدایکی دوور دەکەوێتـەوە گـڕو دەگرێـت و لەپەرۆشی دایکیدا هەنسك دەدات !!

* ئەی بەندەکانی خوا:

تەختەدارێك بەکوڵ بگریت لەپەرۆشی بـۆ پێغەمبـەری خـوا!"ﷺ" دەی ئێـوە ئەولاترن کەپەرۆشبن بۆ گەیشتنەوە پێی.

* وە بزانە ئەی فلان، هەنگاوەکانت دوو هەنگاوە:

هەنگاوێك بۆ خۆتە، هەنگاوێك لەسەر خۆتە، چاوەڕێبن سبەینێ لەکوێ دەبـن؟ وە بۆ کوێ دەچن؟

* مردن .. مردن ﴿كُلُّ نَفْسٍ ذَآئِقَةُ الْمَوْتِ﴾آل عمران١٨٥، الأنبياء٣٥، العنكبوت ٥٧" واتە:" هەمووکەس دەبێت بمرێت و شەرابی مەرگ بنۆشێت".

مافی هەرکەسێکە بزانێت: مردن پێی ئەگات قیامـەتیش جـێ وادەو بەڵێنیـەتی.. بەچاوی خۆی دەبینێت لـەبەینی دەستی خوای گەورە دەوەستێنرێت کەواتە هەقە زۆر دڵتەنگ و خەفەتباربێت.

* ئەی فلان ..

بەجەستەت دۆستایەتی دنیا بکە، بەدڵت لێی دوور بکـەوەرەوە، تـا نەچـیتە ڕیزی دنیاویستان.. پشت لەدنیا بکە، خۆتی لێ بپارێزە، چونکە پیاوچـاکان بـەو شێوەیەبوون. ﴿كُلُّ نَفْسٍ ذَآئِقَةُ الْمَوْتِ﴾ واتە: "هەموو کـەس ئـەبێت بمرێـت و مردن بچێژێت"، بەڕاستی مردن دنیای ڕسـواکرد، وەبـەهاو نرخێکـی وای تێـدا نەهێشتوەتەوە تا خاوەن هۆش پێی دڵخۆش بێت و خۆشیبوێت.

* وە بزانە ئەی فلان بڕوادار لەدنیادا وەك غەریبێك وایە، دۆست و هـۆگری پلەو پایەو سامانەکەی نابێت و بەکەساسـی وناخۆشییەکانیشـی شـپرزەو بێئـارام نابێت..

بۆ خەڵك جۆرێکەو بۆ ئەویش جۆرێك.

خۆت بپارێزە لەهەوەس و ئارەزووبازی، خراپترین دەردێك کەدڵ تێکدەدات: هەوەس و ئارەزووبازییە..

سووربە لەسەر زانست، پەسەندترین و باشترین زانست: "وەرع"[1] و "تەوەککول"[2]ە.

وە بزانە، لەخۆشەویسترین بەندەکان لەلای خوا، ئەوانەن کە"خوا" لەلای بەندەکانی خۆشەویست دەکەن، لەزەویدا کارەکانیان بەڕاوێژو ئامۆژگاری ئەنجامدەدەن..

دینەکەت، دینەکەت بەڕاستی ئەو گۆشتی تۆیە، خوێنی تۆیە...

ئەگەر دینت سەلامەت بوو، گۆشت و خوێنیشت سەلامەت دەبن، ئەگەر وا نەبوو، پەنا بەخوا ئاگرێکە ناکوژێتەوە، سزایەکە هەرگیز تەواو نابێت، نەفسیش نامرێت.

ئەی نەوەی ئادەم ؛ تۆ لەنێوان دوو دەستی پەروەردگارت دەوەستی و بەستراویتەوە بەکردەوەکانتەوە، ئەوەی لەدەستدایە بەکاریبهێنە تا لەکاتی مردندا توشی خێرببیت، پرسیارت لێدەکرێت وەڵامت چییە...

بەندە بەردەوام لەخێردایە هەتا ئامۆژگاری نەفسی خۆی بێت لێی بپرسێتەوە.

هەرکەس توانای هەبێت لە چوار شتدا زاڵبێت بەسەر نەفسی خۆیدا، ئەوا خوای گەورە ئاگری لەسەر حەرام دەکات و پەنای دەدات لەشەیتان،لەکاتی ویست و ئارەزووەکانیدا، لەکاتی ترسدا، لەکاتی هەوەس و داخوازییەکانیدا، لەکاتی توڕەییدا.

---

[1] -وەرع: دوورکەوتنە لەتاوان و دەست هەڵگرتنە لەگومان لێکراوەکان.

[2] -تەوەککول: پشت بەستن بەخوا.

* ئەی نەوەی ئادەم ..

بڕوادار لەوچەند ڕۆژەدا کە لەژیانی تێپەڕدەبێت و دەڕوات کار دەکات بۆ خوای بالادەست، وەڵڵاهی پەشیمان نییە لەوەی کە بەسەریدابێت لەخۆشی و ئاسوودەییەکانی یان لەناخۆشی و نارەحەتیەکانی، دنیا بەدڵی ئەوە تا پێشوازی لێبکات و بەکاری بهێنێت بۆ دوارۆژو توێشووی تێدا ئامادە ئەکات بۆ ئەو کاتە، لە دڵێدا دنیا خانەو جێگای ئەو نییە، داواکاری خۆشیەکانی نییە و بەڵاو ناخۆشیەکانیشی لەدەرونی خۆیدا گەورە ناکات، ئەوەی لەدنیادا دێتە ڕێگای، لەبڕوای ئەودا پاداشتی لای خوا لەسەروەردەگرێت، لەترس و دوودڵیەکان دڵنیای دەکات وەخوای گەورە عەیبەکانی دەپۆشێت و لێ پرسینەوەی ئاسان ئەکات.

* ئەی نەوەی ئادەم ..

تۆ ئەمرۆ لەخانەیەکدایت کەتووشی دڵڕەقی و ڕەفتار خراپیت دەکات بەڕاستی هەوڵدان و تێکۆشانت بۆ دنیا هیچت پێنادات بۆ دوارۆژت، جگە لەوەی پێش خۆت بەرێی دەکەیت بۆی..

ماڵ و سامان بۆ نەفست کۆمەکەرەوەو شوێن هەواو نارەزووەکانی مەکەوە، چاك ئەزانیت هەر بەجێیدەهێڵێت و ئەوەی هەیە لەدوات بەجێ دەمێنێت، چەند ڕۆژانێك لەژیانت وەئەو پلەو مەقامەی کەهەتە بەکاربهێنە بۆ ئەو ماڵەی کەدوا ڕۆژ بۆی ئەچیت، پێش ئەوەی خوای گەورە کۆتایی بەژیانت بهێنێت، بەڕاستی کەس بەویستی خۆی نییە کەدنیا بەجێدەهێڵێت و ئەچێت بۆ ئەو هەوارە.

* ئەی نەوەی ئادەم ..

ئەگەر ئێستا پەشیمان ببیەوە، پێش ئەوەی تووشی پەشیمانیەکی گەورەتربیت، دنیا وازلێ بێنە لەنەفسی خۆتدا لای بەرەو دۆعاخوازی لێبکە،

ئەگەر ئەوەت کرد ئەگەیتە گەورەترین قازانج کەبەهرەو بەخششێکی نەبڕاوە ئەبێت و ڕزگار ئەبیت لەسزایەکی توند کەهیچ ئاسوودەیی و پشوویەك بۆخاوەنەکەی ناهێڵێتەوە.

* ئەی نەوەی ئادەم ..

مەبە بەسوارچاکی خەڵەتێنراو و لەخۆبایی بوون، لەکاتێکدا ڕێگاکە دەبینیت، لەخۆت مەگەڕێ تووشی هەرشتێك دەبیت ببیت .. تۆ بەرپرس و ووتەبێژی لەخۆت..کەواتە لەکردارت دڵسۆزبە، کەڕۆژت لێیویەوە چاوەڕێی مردن بە، کە ئێوارەت لێهات هەروابەو "لاحول ولاقوة إلا بالله" لە سەرفرازترینی خەڵکی ئەوانەن کە لەخۆشی و ناخۆشیدا کار دەکەن بەوەی کە خوای گەورە بۆی ناردوون، وەفەرمان بەبەندەکانی دەکەن گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەر ی خوابن ﷺ، خوای گەورە ڕووەکی ڕواندووە، زیندەوەرانی تێدا بڵاوکردوەتەوە ڕێگاکەی بۆ ڕوونکردوونەتەوە -ڕێگای گوێڕایەڵی فەرمانبەرداری خوا- وە بەڵێنی بەهەشتی پێداون بۆ ئەوە.

هیچ شتێك لەکرداریان لای خوا شاراوە نییە، تێکۆشانیان تیایدا یان سەرپێچییە یان گوێڕایەڵییە بۆئەو، پاداشتی هەمووکەس لای خوا بەگوێرەی کرداریەتی.

* ئەی نەوەی ئادەم ..

ئەوەی لەناخۆشیەکانی دنیا تووشت دێت زەرەرت لێنادات ئیللا خێری دواڕۆژی تێدایە بۆت.. ﴿أَلْهَاكُمُ التَّكَاثُرُ* حَتَّى زُرْتُمُ الْمَقَابِرَ﴾[1]، ئەوە سووك

[1]- التكاثر/ ١،٢: واتە(خەڵکینە !! هەڵپەکردن و پێشبڕکێتان بۆزۆرکردنی"ماڵو منداڵو کۆشك و تەلارو ..هتد"ئێوەی سەرگەرم و سەرگەردان کردووەو بێئاگای کردوون لەخواناسی تائەوکاتەی دەمرن و دەبرێنە گۆڕستان"ئەخرێنە ناو گۆڕی تەسك و تاریك").

کردن و ڕسوابوونی قەومێکـە لەبـەر کۆکردنـەوەی مـاڵو سـامان و دنیـاداری بێئاگابوون لەدینداری و لەبەهەشت بێبەشی کردوون.

ئێمە بەڕاستی هاوڕێیەتی کەسانێکمان کردووە کـە دەیـانووت پێویسـتی ئێمـە لەدنیادا نییە، بۆ ئەو دروست نەکراوین، داوای بەهەشتیان دەکرد، بـە"بەشـەوو ڕۆژو بەگیان و دڵ"سوپاسگوزاری خوایان دەکرد هەتا خوێنیـان تێـدا ڕژا هـەر بەئومێدی ڕزگاربوون و سەرفرازی بوون.

شادمانی بۆئەوان، هیچیان بەرگێکیان نەبوو، ڕاخەرێکیان نەبوو، هەرکـەپێیان دەگەیشتی بەڕۆژووبوون و لەخواترس و ملکەچی بۆ فەرمانی خواو خۆبەبچووک زانی و خۆ بەکەمگرتن لە ئاکارو سیفاتی ئەوان بوون.

هەتاکە دەچـوونەوە مـاڵ هەرچـیان لەبـەردەم دانابـان بۆخـواردن هیچـیان نەدەگووت و بەبێدەنگی دەیانخوارد نەیاندەگووت ئەوەچی یەو ئەوە ...!

* بڕوادار لەدنیادا دیلەو هەوڵدەدات بۆئازاد بوون، لەهیچ شـتێك ئـەمین نییـە هەتا دەگاتەوە بـەخوای "عزوجـل" ، دەزانێـت هـەمووی لەسـەر دەنوسـرێت و وەردەگیرێت لەبیستن و ڕوانین و زمانی، ڕازی بوون قورس و گرانە، بەڵام ئارام گرتن بڕوادار پشت ئەستور ئەکات.

* ئەی نەوەی ئادەم ..

ژیربەو لەسەر نەفسی خۆت بەئاگابە، کەچویتە ناوئاگر هەرگیز وەکو خـۆت لێنایەتەوە، بـڕوادار لـەدنیادا پێشـبڕکێی دنیـاداری ناکـات، لـە ناخۆشـیەکانی دڵگیرنابێت و خەڵکی لەدەستی ئەو ئاسوودەن.

هەرکـەس سوپاسـگوزاری لەسـەر بـەهرەو بەخشـشـەکانی خـوا بکاتـە هێـزو چاودێری کاری!..

وەزەکات دان لەوماڵەی هەیەتی بکاتە شوورەو یاساوڵ!.. زانست بکاتە بەڵگەو سەرکاری خۆی.. لەوێران بوون و بەهیلاك چوون ئەمین دەبێت!..
هەرکەسیش بۆماڵو سامان ڕاوچی بێت، وە زەوتکاری ئەو مافانەبێت کە لەسەریەتی و بەهۆی خەریك بوونی بەهەواو ئارەزوو گوێڕایەڵی خوا لەبیربکات، ئەوا ستەم لەنەفسی خۆی دەکات.

خوای گەورە ڕەحم بەچوار کەس دەکات و خۆشیدەوێن و ڕەحمەتی خۆی بەسەریاندا دەبارێنێت:

* هەرکەس لەگەڵ دایك و باوکیدا نەرمونیان بێت.

* ئەوەی لەگەڵ ئەوانەی لەبەردەستیدان نەرمونیان و لەسەرخۆبێت.

* ئەوەی یارمەتی هەژاران بدات.

* ئەوەش کەکەفالەتی بێباوك و هەتیو دەکات.

* خۆت بپارێزە لە بەرتیل و دەم چەورکردن، چونکە ئەگەر لەدەرگاوە بێتە ژوور، ئەمانەت لەپەنجەرەوە دەچێتە دەر.

* ئاگادارو وریای دنیابە، بەڕاستی کەمن ئەونەی تیایدا ڕزگارو سەرفراز دەردەچن، سەیرنیە بۆ کەسانێك کەتیایدا دەفەوتێن و بەهیلاك دەچن.

چۆن فەوتان ؟ چۆن تیاچوون؟

بەڵام جێگای سەرسوڕمانە بۆ ئەوانەی تیایدا ڕزگارو سەرفراز دەبن، چۆن ڕزگاربوون؟! چۆن سەرفراز بوون؟!.. کەتیایدا ڕزگارو سەرفرازبیت، ئەوا لەو بەڵاگەورەیە ڕزگاربویت، هەرچەندە من خەیاڵ ناکەم تۆ لەڕزگاربوان بیت .. لەگەڵ ئەوەشدا

دنیا هەر هەمووی: سەرەتاو کۆتایی، هیچی تیانییە، تەنیا وەك پیاوێکی نوستوو خەو ببینێت، لەوخەوەدا هەندێك شتی دڵخۆشکار ببینێت..

* ئینجا ووریابە!!!

چۆن پێبکەنین؟

چوزانین خوای گەورە چەندە لەکردەوەکانمان لێوەردەگرێت.. ئەگەر فەرمووی: لێتان وەرناگرم!!

* ئەی فلان ..

دنیات بفرۆشە بەقیامەتت.. لەهەردوولا قازانج ئەکەیت، قیامەت مەفرۆشە بەدنیات .. لەهەردوولا خەسارەتمەند ئەبیت.

* ئەی فلان ..

مردن بەسە ئامۆژگاری کارت بێت، ڕەنگە هەندێ ئامۆژگارییەکان کاریگەریەکی کاتی هەبێت و دوای کەمێك نەمێنێت، لەچاکترینی ئامۆژگاری ئەوەیە کاریگەرییەکەی بەردەوام بمێنێت.

کاتێك ڕووبەڕووی جەنازەیەك ئەبینەوە ترسمان لێدەنیشێت، گریانی گریاوەکان دڵتەنگ و خەمبارمان دەکات وەکو ئەو کۆگەلەی لەحەوت هاوەڵانی ئەشکەوت ترسیان لێنیشت بەڵام کە لەبەرچاو ون بوون: خۆشی و ئاسوودەییەکان گەڕانەوە!!

خوا ڕەحم بە حەسەنی بەصری بکات و لەبەهەشتی بەرین جێگیری بکات و ئێمەش سوودمەند بکات لەزانست و ڕەوشتی جوانی ئەو و لەو پەیام و بانگەوازەی.

## لەنموونەی وتەکانی

ئەگەر وتە شیرین و بەناوبانگەکانی بنوسین بەچەندین پەرتووکێك لەم شێوەیە تەواو نابێت، بەڵام مشتێك لەخەرواری ئەو ووتە بەنرخانەی ئەنووسین.

ڕەحمەتی خوای لێ بێت ئەفەرموێت:

- لەخراپترینی دۆست و هاوەڵانی ئێوە درهەم و دینارن، دۆستایەتی کردنیان هیچ سوودت پێناگەیەنن[1] هەتا لێت جیانەبنەوە.
- واز لەدنیا بهێنن وەڵڵاهی ئەوکەسە دڵخۆش و ئاسوودەیە کەگوێی پێ نادات.
- هاوڕێترین کەس کە دەتەوێت هاوڕێیەتی بکەیت ئەوانەن هاوڕێیەتیت دەکەن وەکو خۆیان.
- ئەگەر ویستت کەموکوڕییەکانی هاوڕێکەت باس بکەیت باسی کەم و کوڕییەکانی خۆت بکە.
- خوشك و برا دینیەکانمان لە کەسوکارمان باشترو بەنرخترن، ئەوان ئاخیرەتمان بیردەخەنەوە، بەڵام زۆربەی کەسوکارمان جەنجاڵمان دەکەن بەدنیاوە.
- شیرینی تەنها لە سێ شتدا هەیەو ئەگەر نەتاندۆزیەوە ئەوا بزانن دەرگاکە داخراوە:

١) نوێژ کردن. ٢)قورئان خوێندن. ٣)یادی خوای پەروەردگار.

- کە لەترسی خوای گەورە گریایت فرمێسکەکانت مەسڕە، چونکە ئەبێتە ڕوناکی بۆڕوخسارت، ئەگەر دەست نوێژت گرت ئاوی دەست نوێژەکەت

---

[1] – مەبەست خۆشویستنی درهەم ودینارە، کە دۆستایەتی و خۆشویستنیان وادەکات، ئەرك و واجباتیان لێ بەجێنەهێنن و لەخێرو بەخشین بیانگرنەوە، ئەوکاتە نەبۆ دنیاو نەبۆ قیامەت هیچ سوودیان لێ نابینن، پارەو سامان ئەبێت لەناو دەستدا بێت نەك لەناو دڵ.

مەسرە، ئەوە ئەبێتە ڕووناکی بۆ ڕوخسارت، لەکاتێکدا لەخزمەتی خوادا ئەوەستیت.

• ئەگەر ویستت دوژمنایەتی کەسێك بکەیت، ئەوا بزانە ئەگەرئەو کەسە گوێڕایەڵی فەرمانەکانی خوابوو، ئەوا دوژمنایەتی مەکە چونکە خوای گەورە نایداتە دەست تۆ، وەئەگەریش سەرپێچی کارو لەخوایاخی بوو ئەوا گوێی پێ مەدەو خۆتی پێوەماندوو مەکە چونکە ئەو یاخی بوونەی خۆی بەسەبۆی.

• ئەم دینە لەنێوان توندگیرو شلگیرەکاندا تیادەچێت، کۆمەڵێك"حەرفی"ن و تەنها پیتەکان ئەخوێننەوەو بەڕووکەشیەوە ئەڕواننە دەقەکان-النصوص-بێ‌ئەوەی لەمەبەستەکان تێبگەن، بنەماکانیان پشت گوێ خستووەو هەموشت حەرام دەکەن، یا دەرگای-إجتهاد-دائەخەن.

"تأویل"چییەکانیش دەقەشەرعییەکان بەئارەزووی خۆیان بەکارئەهێنن بۆهەرمەبەستێك کەبیانەوێت، خەریکن هەمووشتێك حەلاڵ ئەکەن و لۆمەی مەزهەب و اجتهادەکان دەکەن.

بەلاّم ئەوەی کەدین سەلامەت ئەکات بریتی یە لەپۆلی "میانڕەو" ئەوانەی جیاوازی ئەکەن لەنێوان زیادەڕەوی و کەم تەرخەمی، عەقلّی زاناودڵو دەروونی پارێزکاران ئەکاتە یەك.

• لەنیشانەکانی بڕوادار دینی بەهێزە، لەسەر کرداری چاکە سوورە، لەوپەڕی دڵنیایی و یەقیندایەو هیچ گومانێکی نییە، کار بەزانست ئەکات و بەبێ زانیاری بڕیاری شت نادات، ڕەفتاری نەرم و نیانە، مافی کەس پێشێل ناکات و لەدەوڵەمەندیدا ئەبەخشێت و پاشەکەوتیشی ئەکات، وە لەبرسێتی و نەداریدا خۆڕاگرو بەئارامە، لەهێزو دەسەلاّتداریدا چاکەکارو چاکەخوازە، پارێزکارو دەستهەڵگرە لەهەوەس و ئارەزووبازیدا، پاکیزەو بەئارامە لەکاتی بەلاّو ناخۆشیدا،

بەهۆی خواستی هەرزەکارانەوە تێناکەوێت و نافەوتێت، چونکە لەخواست و ویستەکانیدا هەرزەو بێئاگانییە، زمانی توشی هەڵچوون و هەڵەشەیی ناکات، لەقسەکردندا دەست پێشخەری ناکات، چاوەچاو ناکات، لەکاتی خۆشگوزەرانی و شادی دا خۆی لێ ناگۆڕێت، مەیلی بەلای هەواو خۆپەرستیدا نییە، دەم شڕو زمان لووس نییە هەرلەبەر ئەوەیشە بەهۆی زمانیەوە سووك و شیرین نابێت، ڕژدو چاو برسی نییە، لەقسەی خۆش و زمان پاراویدا درێغی نییە.

● مالك کوڕی مەغلول ئەڵێت حومەید وتی: لەڕۆژێکی مانگی ڕەجەب لەمزگەوت بووین حەسەن قومێکی لەئاوداو ئینجا تفی کردەوە، هەناسەیەکی دا بەهەناسەیەکی قووڵ، ئینجا گریا، هەتا لەگریان شپرزەبوو ئەلەرزی ..! پاشان وتی: ئەگەر لەدڵەکاندا چاکی یەك هەبێت، ئەتانگریەنێت لەشەودا کەوەك بەیانی قیامەتە، بەڕاستی شەو لێکدانەوەیە لەبەیانیەکی قیامەت.

● إبن ئەبی دنیا ئەگێڕێتەوە کەحەسەن لەزەمی غەیبەتدا ئەفەرموێت: وەڵڵاهی غەیبەت بۆدینی بڕوادار خراپترە لەخۆرەو کرم لەجەستەیدا، وە"ئەصلت کوڕی طریف" ئەڵێت: بەحەسەنم وت: پیاوێکی گوناهکار کەگوناهەکانی بەئاشکرایی ئەکات، بۆمان ڕوونکەوە ئایا باسکردنی چۆنە؟ غەیبەتە؟ فەرمووی: نەخێر، وە ووتی: سێ کەس هەن کەغەیبەتیان حەرام نییە(ئەوانەی بەئاشکرا تاوان ئەکەن، ئیمامی ستەمکاری زۆردار، داهێنەری داهێنانێکی گومڕایانە).

وە فەرمووی: وتراوە هەرکەسێك براکەی تاوانباربکات بەگوناهێك کەزووترکردوویەتیو ئێستا تۆی لێکردووە، ئەوکەسە نامرێت هەتاتووشی ئەو گوناهە نەبێتەوە.

° محەمەد کوڕی عومەر ئەڵێت: گوێم لێبوو حەسەن ئەیووت: گوێم لە ئەبو هورەیرە بووە دەیفەرموو: "دەستنوێژ ئاگر ئەگۆڕێت"، ووتی حەسەن ووتی: لەبەرئەوە هەرگیز وازی لێ ناهێنم.

° پیاوێك هەبوو سوورو سپی لەبەردەکردو ئەیووت ها سەیرم بکەن، حەسەن فەرمووی: بەڕاستی ئەتبینین ئەی خراپترینی خراپەکاران، نەخێر بۆ تۆ، بەڕاستی ئەهلی دنیا بەڕوانینیان بۆ تۆ لەسەردنیا زۆرتر سوورئەبن و وە توانایان زیاترئەبێت بۆ هەوەس و شەهەوات و دەوڵەمەند کردنی سك و پشتیان، بەڵام ئەهلی قیامەتی ڕقیان لێت ئەبێتەوە و خۆشیان ناوێیت، ئەوان بەخێرایی ئەڕۆن و بەجێتدەهێڵن.

° موسلیم کوڕی ئیبراهیم ووتی: ڕەبیعە کوڕی کلثوم ووتی: گوێم لەحەسەن بوو فەرمووی: ئەبوهورەیرە پێی ووتین: پێغەمبەر"دروودی خوای لێ بێت" پەیمانی لێوەرگرتم بەخۆشۆردنی هەموو ڕۆژێکی هەینی، ویتری پێش نووستن و بەڕۆژووبوونی سێ ڕۆژ لەهەموو مانگێکدا.

° "طلحەی کوڕی عەمروی حەضەری" وتی: حەسەن هاتەلامان فەرمووی لەگەڵ "عطا" دانیشتبووین، گوێم لێبوو حەسەن فەرمووی: خوای گەورە ئەفەرموێت: ئەی ئادەمیزاد دروستمکردویت و غەیری من ئەپەرستی، یادت دەکەم و لەبیرم ئەکەی بانگتدەکەم و لەبەرم ڕائەکەیت، بەڕاستی ئەوە ستەمترینی ستەمە لەزەویدا ئینجا حەسەن ئەو ئایەتەی خوێندەوە:﴿ يَا بُنَيَّ لَا تُشْرِكْ بِاللَّـهِ إِنَّ الشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ﴾.

° ئەبو عوبەیدە ئەڵێت: حەسەن فەرمووی: هەر پیاوێك بینی خوا نیعمەتێکی پێ بەخشی و وتی: سوپاس بۆئەو خوایەی کەئەو نیعمەتەی پێدام و چاکەی پێوەکرد، ئیللا خوای گەورە دەوڵەمەندی ئەکات و بۆی زیاد ئەکات.

° عـوتبی لـەباو کییـەوە ئەگێڕێتـەوەو ئـەڵێت: نەخۆشـێك هاتـەلای حەسـەن کەلەنەخۆشیەکەی چاك بووبوویەوە و ئەویش ووتی: ئـەی پیـاو خـوای گـەورە یادی کردوویت یادی بکەوە، لەگەڵتدا دواوە سوپاسی بکە، بەڕاستی نەخۆشی، جاری دەنگێکە لەلایەن خوای فەرمانڕەواو خاوەن شکۆوە، ئینجا نەخۆش دوای چاك بوونەوەی نەخۆشیەکەی یادەبێتە سوارێکی سەربەرز، یائەبێتە گوێدرێـژێکی ڕۆژگار خراپی فەوتاو[1].

° صالح کوڕی ڕۆستەم ووتی: گوێم لەحەسەن بوو کەفەرمووی: خوای گەورە ڕەحم بەپیاوێك ئەکات کەلەخۆبایی نابێت بەوەی کەلەخـەڵکی زیـاتری هەیـە، بزانە ئەی نەوەی ئادەم، بەتەنیا ئەمریت، بەتـەنیا ئەچـیتەگۆڕەوە بەتـەنیا زینـدوو ئەبیتەوە، بەتەنیا لێپرسینەوەت لەگەڵدا ئەکرێت، ئاگات لەویستەکانت بێت.

° ئەبی عوبەیدەی ناجی ئەگێڕێتەوە: حەسەن فەرمووی: ئەگـەر خـەڵکت دیـت پێشبڕکێیان لەگەڵ بکە ئەگەر لەهیلاکەتدا سەری دەرکردنـەوەی هەڵبـژاردووە بۆنەفسـی خـۆی، کەسـانێکمان دیتـووە کـەکارتێکردنی ئێسـتایان زیـاتربووە لەدوارۆژیان، ئەوا ڕیسـوابوون و بەهیلاك چـوون، ئـەی نـەوەی ئـادەم: فـەرمان ڕەوایی دوانە، ئەوەی حوکم بە فەرمانی خوابکات ئەوا پێشەوایەکی دادپەروەرە، ئـەوەی حـوکم بەغـەیری فـەرمانی خوابکـات ئـەوا فەرمانڕەوایـەکی نـەفام و نەزانانەیە.

بەڵاك خـەڵکی سـێجۆرن: بـڕوادار، بـێبڕوا، دووڕوو، بەڕاسـتی بـڕوادار گوێڕایەڵی فەرمانی خوایە، بێبڕوا خوای گەورە ڕیسوای ئەکات وەکـو ئـەبینن، بەڵام"دووڕوو" لەگەڵمانن لەماڵ، لەڕێگە، لەبازاڕ، پـەنامان بـەخوا، وەڵڵاهـی

[1]/ ئەگەر بەئارام بێت و ناسوپاسی نەکردبێت ئەوا سواری سەربەرزە بەڵام ئەگەر ناسوپاس بوبێت و تۆبەو لەگوناهەکانی نەکات ئەوا ڕۆژگاری خراپ و فەوتاوە.

خوای خۆیان ناناسن، سەرپێچی فەرمانی خوائەکەن بەکردەوە پیسەکانیان، بڕوادار بەترسەوە ڕۆژدەکاتەوە لەبەرترسی خوا، نەکاتووشی خراپەیەك بێت، یائەوەی ڕۆیشتووە نەکاتووشی خراپەیەك بووبێت.

° "جویریة کوڕی بەشیر" وتی: گوێم لەحەسەن بووە ئەو ئایەتەی خوێندەوە ﴿إِنَّ اللّهَ يَأْمُرُ بِالْعَدْلِ وَالإِحْسَانِ وَإِيتَاء ذِي الْقُرْبَى وَيَنْهَى عَنِ الْفَحْشَاء وَالْمُنكَرِ وَالْبَغْيِ يَعِظُكُمْ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ﴾[1].

دوای وەستاو ئینجا ووتی: خوای گەورە هەر هەموو خێرو شەڕێکی لەو ئایەتەدا کۆکردوەتەوە، وەڵڵاهی هیچ شتێکی لەدادپەروەری و چاکەخوازی بەجێنەهێشتوە لەفەرمانبەرداری خوای گەورە هەمووی تێدایە، وەهیچیشی لەبەدڕەوشتی و خراپەکاری بەجێ نەهێشتووە لەسەرپێچی فەرمانی خوای گەورە هەمووی تێدایە.

° هەندێك کەس هاتنە لای ئیمامی حەسەن و ووتیان: سیفاتی هاوەڵانی پێغەمبەرمان (ﷺ) پێ بڵێ: ئەویش گریاو فەرمووی: ئەوان نیشانەی دەرکەوتنی خێربوون لەزەوی تا ئاسمان، وەنیشانەی هیدایەت و ڕاستگۆیی بوون ئەوان بەرگیان زبر بوو بۆ کەم مەسرەفی و ڕۆشتنیان بە خۆ بەکەمزانی و گوفتارو کرداری وەکو یەك و خواردن و خواردنەوەی حەڵاڵو ملکەچی و گوێڕایەڵیان بۆ خوای گەورە، سەرکردەبوونیان لەهەق و ڕاستیدا کە پێیان خۆشبێت یان ناخۆش، جێبەجێ کردنی هەموو ئەوئەرك و مافانەی لەسەریان بوو، لێبووردەیی و لێخۆشبوونیان بەرامبەر بەخەڵك و خواردنەوەی ڕق و تووڕەییان

[1] - النحل/ ٩٠، واتە: بەڕاستی خوا فەرمان ئەدات بەدادپەروەری و چاکەکاری و یارمەتیدان و بەخشندەیی بەخزمان و قەدەغە لەگوناهوتاوان و دەستدرێژی ئەکات"بۆسەرماڵو نەفس و ناموس"و ئامۆژگاریتان ئەکات بۆئەوەی یادەوەری وەربگرن و تێفکرن.

لەدروستکراوانی خوا بۆ ڕازیکردنی خوا لەخۆیان هەرگیز زیادەڕۆییان نەکردووە جەوورو ستەمیان نەدەکرد، لادانیان نەبووە لەفەرمانی خوا لەقورئاندا، زمانیان بەیادی خواوە خەریك ئەکرد، خوێنیان ئەبەخشی تاسەرکەوتن،ماڵیان ئەبەخشی لەپێویستی و قەرزیاندا، هەرگیز ترسیان لەدروستکراوان ڕێگەی لێنەگرتوون و نەبووە، ڕەووشت و ڕەفتاریان جوان بوو، دنیایان تەنها بۆ ئامادەکرنی توێشووی دوارۆژ ئەویست، خۆیان لەحەلاڵ ئەپاراست زۆر زیاتر لەوەی کەئێوە لەحەرام خۆتان ئەپارێزن، شوێنکەوتەی سوونەتی پێغەمبەر(ﷺ)بوون، کاریان بەپەڕاوی خوا دەکرد.

## وەفاتی

"ئەبو طارقی سەعدی" دەڵێت: لەلای حەسەن بووم دیتم لەکاتی وەفاتیدا وەسیەتی دەکرد، بە نووسەرەکەی دەووت: (( ئەوە شاهێدیدانی حەسەنی کوڕی ئەبو حەسەنە کەشایەتی داوە کەخوا تاك و تەنهایەو لەو خوایە زیاتر هیچ خوایەك نییە، محمد"دروودی خوای لێ بێت" نێردراوی ئەو خوایەیە، وە هەرکەس ئەو شایەتییە بدات بەڕاستی و لەدڵەوە لەکاتی مردنیدا، ئەوە دەچێتە بەهەشتەوە...)).

"ئابان کوڕی محبەر" گێڕایەوە: کە ئیمامی حەسەن لەسەرەمەرگدابوو، چەند پیاوێك لەهاوەڵانی هاتنەلای ووتیان: ئەبا سەعید چەند ووتەیەك بەهۆیەوە سودمەندبین، فەرمووی: من سێ ووتەتان پێ ئەڵێم بەقسەم بکەن و پێی هەستن:

- ئەوەی نەهی کراوە لەسەرتان، ئێوە لەناو خەڵکدا لەو کەسانەبن کەتەرکی ئەکەن.
- ئەوەی ئەمرتان پێکراوە لەچاکە ئێوە کەئەیکەن.

- بزانن هەنگاوەکانتان دوانن، هەنگاوێك بۆ ئێوەیە هەنگاوێك لەسەرئێوەیە، بڕوانن سبەینێ لەکوێن و بۆکوێ ئەڕۆن.

بەڵێ لەشەوێکی هەینی لەسەرەتای مانگی ڕەجەبی ساڵی"١١٠"سەدو دەی کۆچیدا ئیمامی حەسەن گەڕایەوە بۆلای خوای پەروەردگاری خۆی.

کاتێك ڕۆژیان کردەوەو دەنگ و باسی وەفاتی لەناو خەڵکدا بڵاوبووەوە، بەڕاستی ئەم دەنگە بەصرەی هەژاندو لەرزانیەوە!..

"هیشام کوڕی حەسان" ئەڵێت: لەلای "موحەممەدی کوڕی سیرین" بووین، پیاوێك هاتە ژوورەوە بۆلای و وتی: حەسەن وەفاتی کرد. موحەممەد ڕەحمەتی بۆناردو ڕەنگی گۆڕاو لەقسەکردن وەستا، تاماوەیەکی زۆر قسەی نەکردەوە، ئەوکەسانەی لەدەوروپشتی بوون وەستابوون بەسەریەوە بینییان ئەوهەواڵە کاری تێکردەوە...

"موحەممەدی کوڕی سیرین"یش زۆردوای ئەو نەمایەوە بەڵکو تەنها بەتێپەڕبوونی"١٠٠" سەد ڕۆژ دوای ئەو وەفاتی کرد.

"عبداللە کوڕی شێخ حەسەنی بەصری" ئەڵێت: کە باوکی تەمەنی ٨٨ ساڵبووە لەسەرەتای مانگی ڕەجەب دا وەفاتی کردووە.

بەڵێ دوای ئەو تەمەنە پیرۆزو پڕبەرەکەتە، گەڕایەوە لای خوای خۆی، "ئەییوب و حەمید" شۆردیان، خەڵکی هەموو کۆبوونەوەو تەواوی بەصرە شڵەقابوو.

ئینجا کفنیان کردو لەدوای نوێژی هەینی هەرلەو مزگەوتەدا نوێژیان لەسەرکرد کەکاتەکانی ژیانی لەوێدا بەسەربردبوو بەزانایی و بەمامۆستایەتی و بەبانگەوازی بۆلای خوا.

تەواوی خەڵکی بەصرە شوێنی جەنازەکەی کەوتن و لەگەڵیدا ڕۆیشتن، بەجۆرێك ئەو ڕۆژە نوێژی عەسر لەمزگەوتدا ئەنجام نەدرا چونکە تەواوی خەڵکی بەصرە چووبوونەدەر لەگەڵ جەنازەی موبارەکیداو سەرقاڵی شاردنەوەو ئەسپەردەکردنی بوون و کەس لەشاردا نەمابوو تانوێژی تێدا بکات.

لەوکاتەی ئەو مزگەوتە لەلایەن موسڵمانانەوە دروستکرابوو، تەنها یەك نوێژی تێا ئەنجام نەدرا ئەویش ئەو ڕۆژەی وەفاتی شێخ حەسەنی بەصری بوو ڕەحمەتی خوای لێ بێت.

بەڕاستی خەڵکی بەصرە بۆی پەرۆش و خەمباربوون، بەوەفاتی ئەو دڵگیربوون، خەم وەکو هەور سێبەری لەسەرکردبوون.

هەزاران ڕەحمەت لەسەر زانای پایە بەرز..

## سەرچاوەکان


| سەرچاوەکان | داتەر |
| --- | --- |
| ١- القران الكريم | |
| ٢- تەفسیری ئاسان | بورهان محمد ئەمین |
| ٣- رياض الصالحين | الإمام أبى زكريا يحي بن شرف النورى |
| ٤- الطبقات الكبرى ج٧ | محمد بن سعد بن منيع الزهري |
| ٥- إحياء علوم الدين | الإمام أبى حامد محمد بن محمد الغزالي |
| ٦- طبقات الصوفية (كواكب الدرية) ج١ | زين الدين محمد عبدالرؤوف المناوي |
| ٧- البداية والنهاية ج٩ | أبي الفدء الحافظ ابن كثير الدّمشقى |
| ٨- حلية الاولياء و طبقات الآصفياء | للحافظ أبي نعيم أحمد بن عبدالله الآصفهاني |
| ٩- صور من حياة التابعين (الكتاب الثاني) | د. عبدالرحمن رالحت الباشا |
| ١٠- (تاريخ الاسلام ووفيات المشاهير والاعلام حوادث ووفيات (١٠١-١٢٠) هجري | للحافظ المؤرخ شمس الدين محمد بن أحمد بن عثمان الذّهبي |
| ١١- سير اعلام النبلاء ج٤ | الامام شمس الدين أحمد بن أحمد بن عثمان الذّهبي |
| ١٢- صفة الصفوة ج٣ | للامام جمال الدين أبي الفرج ابن الجوزي |
| ١٣- وفيات الاعيان وأنباء أبناء الزمان ج٢ | أبي العباس أحمد بن محمد بن ابراهيم بن أبي بكر بن خلكان |
| ١٤- رجال الفكر والدعوة | أبو الحسن علي الحسني الندوي |
| ١٥-ئینتەرنێت | د. خالد سعد النجار |

Alnaggar٦٦@hotmail.com:E-MAIL

# پۆزش

داوای لێبوردن لەخوێنەرانی ئازیزی ئەم پەرتوکە دەکەین .. کەهەندێ هەڵەی ڕێنووسی لەکاتی پیتچنیندا بەسەرماندا تێپەڕیون..

## لیستی هەڵەکان

| ژ.لاپەڕە | ژ.بڕگە | ژ.دێڕ | هەڵە | ڕاست |
|---|---|---|---|---|
| ٥ | ٤ | ١٧ | .... | مەگەر |
| ٥ | پەراوێز | ٢ | تەزۆکە | نەزۆکە |
| ١١ | ٣ | ١٢ | کچێکیشی | کچێکیشە |
| ١٣ | ٣ | ٩ | ڕزارە | ڕازاوە |
| ١٣ | ٤ | ١٠ | ناو | ناوت ناوە |
| ١٥ | ٤ | ١٨ | پێغەمبەرانە | پێغەمبەر |
| ١٧ | ٢ | ٨ | سەردەبوو | لەسەردەبوو |
| ١٩ | ١ | ٢ | جیشتەجێ | نیشتەجێ |
| ٣١ | پەراوێز | ٢٠ | فریشتەم | فریشتەنیم |
| ٣٢ | ١ | ٢ | یانا | یان |
| ٤٧ | ٣ | ١٠ | ئەبوبەردە | ئەبودەردە |
| ٦٣ | ٣ | ١٠ | لەمەودا | لەمەودوا |
| ١٠٧ | ٢ | ١٩ | تۆی | تەوبەی |